# گوڵبژێرێك لە پەندی كوردی

ئامادەكردن و كۆكردنەوەی
هۆشیار نوری لەك

# گوڵبژێرێك

# لەپەندی کوردی

ئامادەکردن و کۆکردنەوەی

**هۆشـــیار نـــوری لـــەك**

.

٢٠٠٦

ناوی کتێب: هەڵبژاردەی پەندی کوردی
بابەت: فۆلکلۆر
ئامادەکار : هۆشیار نوری لەك
تیراژ: (١٠٠٠) دانـــە
چاپ: چاپخانەی چوارچرا
نەخشەسازی و بەرگ : کۆمپیوتەری (هیـــوا)

لەکتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (٦١٨) ساڵی ٢٠٠٦ دراوەتێ

لەبڵاوکراوەکانی نواڵەی نوێ زنجیرە (٥٥ ) چاپی یەکەم
٢٧٠٦

بەناوی یەزدانی باڵا دەست

**هۆشیار نوری لەك**

سڵاوی ڕەسەنایەتیو ئەمەكداریو خۆشەویستیتان لێ بێ، فۆلكلۆر پەروەرانو دۆستانی كەلەپوور، بەئومێدم لەو پەڕی سەرفرازی گوزەر بكەن، هەگبەتان پڕاوپڕ بێت لەكەلتووری نەتەوایەتی.

بەڕێزان.. هەڵبەتە فۆلكلۆر پەروەرانی پێش من زۆر بەجوانی بەگەلێ جۆرو شێوە باسیان لە (پەندی پێشینان یا پەندی كوردی) كردووە، بۆیە من نامەوێت ئەو قەوانە دووبارە بكەمەوە، بەرام دەبی (شەكرەكی بشكێنم) تازیاتر لەناوەڕۆكی كتێبەكەم تێبگەن.

ئەم كتێبەی لەبەر دەستاندایەو دیدەنیتان ڕۆشەن دەكات تایبەتە بە (پەندی كوردی)، پەندەكانیش زیاتر پەیوەستە بەبارو ژیانی كۆمەڵایەتیو دەوروبەری مرۆڤ، هەوڵم داوە هەموو ئەو پەندانە بهێنمە لای یەكتری كەلەسەریەك بوارو لایەنە كەئەمەش وەك بیرهێنانەوەیەكە بۆ نەوەكانی ئێستاو داهاتوو، بەهیوام ڕۆڵەكانی میللەت گشت ئەو پەندە كوردییانە ئەز بەر بكەنو سوود لەتاقیكردنەوەكانی ڕۆژگار وەربگرن، دەبێ ئەوەش بڵێم كەهەموو پەندەكان.. سەرەتا پێناسەیەكی لایەنەكە كراوەو دواتر (پەندەكان) شیكراونەتەوە، ئەمەش زیاتر كار ئاسانییە بۆ تێگەیشتن لەپەندە كوردییەكان.

لەكۆتاییدا هێڤی خوازم كتێبەكەتان بەدڵ بێتو پەندەكانیش شوێن خۆی بگرێ، ئیتر ماڵئاوا تابەرهەمێكی تری كوردەواریو ڕەسەنایەتی میللەتەكەمان.

# لەجیاتی پێشەکی

**ئەسعەد عەدۆ**

هەر چەندە پێشەکی نووسین لەدنیای ئەدەبو رۆشنبیریدا کارێکی باوە، لەهەمان کاتدا کارێکی گرینگو سەختو دژوارە، بۆ خودی خوم دەگەڵ ئەو جۆرە پێشکیانەدام کەلایەنی هەڵسەنگاندنی تێدا بەدی دەکرێت، کەچی بەداخەوە تائێستا ئێمەمان نەگەیشتوونەتە ئەو قوناغە کەبتوانین بەدوای خەڵکانێك بگەرێین تاکو قەڵەمەکەی تەنیاو تەنیا لەخزمەت ناوەرۆکیناميلکەکەدا بەکاربێنێ.

بەهەرحاڵ منیش رۆژانێك حەزم بەوە دەکرد کە رادەرێکم پێشەکی بۆ ناميلکەکانم بنووسێ.. ئەو حەزەش هاتەدی. سوپاس بۆ خودای دلۆڤان ئەوەتە ئەمرۆ لەژێر سێبەری فەرمانرەوایی کوردان لەرۆژگاری کوردایەتیدا ئەو برایە خۆش مەحشەرم.. ئەو ماندوو نەناسە کەلەدوای (١٠) ساڵ دابرانمدا لەکوردستان لەرێگەی نووسینەکانی (نواڵەی نوێ) و (هونەرستان) جارێکی دیکە خەڵکی خەوتووی کوردستانی بەرامبەر بەکەلەپووری باوان لەمن واگا هێنا لەسارده زستانی کوردستاندا پێکەوە کۆرو مەجلیسی کوردەواریمان گەرم کردەوە بەخۆزگەی ئەوە بووین شۆرشێکی نێو شۆرشی کەلەپووری کوردی هەڵبگیرسێنین هەروەکو پێشتر لەتاریکە شەوی کوردستاندا ئێمەی مەحشەری فۆلکلۆرپەروەران هەریەکە لەشوێنی خۆیدا دریغی نەکرد.. دەست بەدەست ئەو ئەمانەتەمان گەیاندە ئەو برادەرانە کەکاك هوشیار نووری لەك یەکێکە لەبزێوەکانی.

لەکاتی خۆیدا ئێمەمانان ئەڤینی کیژە کوردانمان مەبەست بوو، عیشقی شۆخو شەنگی کچۆڵەیەکی کورد بەجلو بەرگی کوردییەوە بەناخماندا گوزەری دەکرد، ئاڵوگەری دیارییەکان بریتی بوو لەجوانترین پەخشانە حەیران یان لەنێو حەشاماتی ئاشقاندا شانازیمان بەوێنە شیعرەکانی نێو لاوکی دەروێشی ئەڤینداری دەکرد سەد هەزار جار خۆمان بەخولامی شێرو رمی دەروێش دەکردو دەگەڵ بەندە بەسۆزەکەی (عەدولێ) دەتواینەوە بەتایبەتی کە دەڵێ:

*ئەزێ رابم جۆتە مەکا خۆبکەمە فنجانێ قەهوێ*

*دانێمە سەر سینیەکا زێرِ بەردەمە شوبایێ شەوێ*

دەشقم کورە هەتیمە لاوێ من لەبەر بۆنی مەمکان بەرەو ماڵ تێ

ئێمە نەواری لاوکو حەیرانو بەیتە کوردیەکانمان خستە نێو مۆدێرترین ئۆتۆمبێلی زەمانی خۆی، شاڵی کوردەواری، پشدێنی قەفقەف، کلاشی هەورامان یان کرمانشا ڕوخساری ویقاری جوامێرانی کوردەواری بوو، هەموو ماڵە کوردستانیەک بەشانازیەوە بەدوای پارچەیەک لەکەلەپووری باوان دەگەڕا بۆ ئەوەی سوچێکی پێ برازێنێتەوە.

من ڕۆژانێک گەڕامەوە کوردستان، خەڵکی خۆمان گاڵتەیان بەڕابردووی خۆمان دەکرد، حەیرانو لاوک گوێ بیستی نەمابوو، ئۆتۆمبێلەکانی ئەو سەردەمە لەسەر ئاوازی (نانسی عەجرەم) مێشکی منداڵەکانمانیان دەتوڵخێننەوە! مەسەڵەتی بەحوکمی دەفتەرە دۆلاران یەکلا دەکرێتەوە، کەچی لەزەمانی خۆیدا لەسەر سمێڵ دانان هەموو گرێکۆرەیەکی واڵا دەکردەوە.. لەزەمانێک

كەرامەوە سەروجامانی لەسەری كوردەواری بە (مانع التفكیر) دەفەلەم دەدرێن!! ئالەم كاتە ناسكو دژوارەدا چەند كەسانێك هەبوون دژی ئەو شەپۆلە مەلەیان دەكرد بەدەستو قاچ جلەوی نەریتی ڕەسەنی كوردەواریمان لەهەوكێ خۆشەتەكدا بوو تاكو ئەوەندەی مابوو نەبێتە ئاردی ناو دڕكان.. كاكە هوشیار یەكێكە لەو ڕەسەن دۆستانە.

ئەو سەربازانەی مەیدانی ئەدەبی فۆلكلۆر لەگاڵتە پێكردنی ئەو نەزانانە نەسلەمینەوە بەگیانێكی وەرزشانە تیرەتوانجی ئەوانیان دەقۆزتەوە، حقدوكینەی كوێرانەی ئەوانەیان بەپەند، مەتەڵ، هەقیانەت، ئەفسانە، لاوكو حەیران بڵاوكردنەوەیەك شێوازی دەكرد.

سەرەڕای ئەوەیش فۆلكلۆر ویستان لەخەباتی پیرۆزی خۆیاندا بەردەوامن.. ئەگەر هاتوو سەرنج بدەینە تەمەنو بەرهەمە جیاجیاكانی كاكە هوشیار بۆ هەموو لایەك ڕوون دەبێتەوە كەبارەكە هێشتا بەی دنیای فۆلكلۆردایە، نەك لەبەر ئەوەی دنیایەكی ڕەسەنە بەڵكو كارێكی پیرۆزە.. زۆرجار لەگەڵ خۆمدا دەكەومە حیوارێكی دوورو درێژ دەڵێم: تۆبڵێی كەسانێك هەبێت بتوانێ دژایەتی نەتەوەیەك، میللەتێك، كۆمەڵگایەك بكات؟! بەهەموو پێوەرێك نەخێر، چونكە ئەو مەیدانە بەرفراوانە ئامانجو ویستی زورینەی كۆمەڵگایە لەبەر هەندێ هەر چەند دنیا بەرەو پێش بچێت ئەو عەولەمەی باسی لێوەدەكرێ بەئاسمانی كوردستاندا باڵە فڕكێ ...كات لەناخی هەموو تاكێكی كوردەواریدا حەزی فۆلكلۆر ویستێك ...نوێ سەر هەڵدەدا بەتایبەتی ئەو كەسانەی نێویان لەخۆناوە ...وار چونكە لەو دنیا نوێیەیانەدا خۆیان بەنامۆ دەزانن!!

چەند ساڵێکی هوشیار بۆ خزمەتکردنی کەلەپووری کوردان پـێ لەرکێفە.. ساڵ بەساڵ گورزی فۆلکلۆریانەی خۆی دەوەشێنێ واتـە ساڵانە باشتر وایە بڵێم: مانگانـە سـەگلاوی خـۆی لـەو مەیدانـەدا تاودەدا جارێکیان کتێبی (گەنجینەی کەلەپوور)و (هەگبـەی مێـژوو) مەتەڵە زۆرو زەوەندەکانی، دیوەخانەکەی کەبـەدیوەخانی (سـپاغە) نێوی دەبەم واتە بەرنامە تەلەفزیۆنەکە، جار هەیە نواڵەی نوێ سەر هەڵـدەدا، زۆرجـاریش هونەرسـتان بارانمـان دەکـات، ئـەوەتا ئـەمجارەیان بـەئیجازەی پسـپۆرانی ئـەو مەیدانـە رکێـف لەمەیـدانی پەندی کوردی دەدات کەهەر پەندێکیان سەربردەیەکە چونکە دنیای پەنـدو قسـەی نەسـتەق مەیـدانێکی دیکـەی بـەرفراوانی ئـەدەبی فۆلکلۆری کوردە.

خوا شاهێدە بەخۆزگەی زیاتر نووسـین بـووم، بـەڵام ئـەو شـینگو تاقەتەی ئێستای کاکە (هوشیار نوری لەك) بەرەو ڕۆژانی کێخوایەتی فۆلکلـۆری خـۆم دەباتــەوە کەهێنـدەی نـەماوە ئاهـەنگی سـەنگەر گواسـتنەوەی ئـەو کێخوایەتییـە بـۆ خـەمخۆرێکی وەك (هوشـیار) بدەین.

# ( خــــودا ) .. له پەندی كوردیدا

خـوای مـەزنو دڵۆڤـان كەدروسـتكراوی ئـەم بونەوەرەیـە، بـەجوانترین شێواوەو شـێوازیش مرۆڤـی دروسـتكردووە، لەهەمووكـەس بێكەسـترەو لەهەموانیش بەتواناترو بەخشندەترە، هەرچی مەیلی لێ بی بەخێراترین و چاكترین جۆرو شێواز دەیهێنێتە بوون، هەر ئەو دەتـوانی لەنەبوونـەوە گیان ببەخشێو بیهێنێتە بوون، له بوونەوەش، نەیهێڵێو لەناو ببات.

خوای پەروەردگار ئاگەداری هەموو كـەونو كەلبـەرێكی ئـەم جیهانەیـە، بەچاكو خراپ، رەش و سـپییەوە، ئێمـە هەرچـەند باسـی مـەزنی خـوای بەخشندە بكەین مافی تەواوی خۆی پێنادەین، ئەوەی مەبەستی ئێمەیـە لێـرەدا باسـی بكـەین دەربـارەی ئـەو پەنـدە كوردییەانەیـە كەوشـەی (خودا)ی تێدایە، بە هیواین سوودبەخش بێت بۆ گەشت لایەك:–

*** خودا بەسەبرەو بەزەبرە:**

– واتە خودا لەسەرخۆیەو دەست وەشێنە.

*** خودا بەردی گەورەو گچكەی دانایە:**

– واتە گەورەو گچكەیی هەر هەبووە.

*** خودا دەدا، خوا گیر لێ ناگەڕێ:**

– بەشتێك دەڵێن باش بۆت بسوڕێو كەسانی تریبنەكۆسپ.

*** خودا دەدا، نازانی بخوا:**

بەیەكێك دەڵێن باشی بۆ بێتو نەزانی بیخواتو لەخۆی تێكبدات:

*** خودا دەزانی و خواداش دەزانی:**

– كارێكی چەوت دەڵێت لای هەموو كەس ئاشكرابێت.

*** خودا ده‌لیلی، لۆ زه‌لیلی په‌یدا ده‌كا:**

– واته‌كه‌س په‌كی ناكه‌وێت

*** خودا هێلانه‌ی لۆده‌عبای كۆره‌ش ده‌كا ( خوا هیلانه بۆته‌یری كۆره‌ش دروست ئه‌كات ):**

– واته‌نابووتانیش شێوه‌ی خۆ ژیاندنیان هه‌یه.

*** خوایاربێ ، بادوژمن هه‌زاربێ:**

– كه‌بۆت هات دوژمنی زۆر گلۆر ده‌بێت.

*** خودا یاربی، باشیرت داربی:**

– كه‌كه‌سێتیت بوو، هه‌رسه‌ركه‌وتووی.

*** خودایه دوو پێن دیت، چارپێن نیشان نه‌ده‌ی**

– بۆكارێكی ناڕه‌واو ناله‌بار به‌كاردێت.

*** خودایه ئه‌وی زه‌مانی، هه‌ركه پیاو ده‌چنه كاروانی ژن ده‌گێرن دیوانی، منداڵ ده‌داته‌وه جوابی مێوانی:**

– كه‌تان و پۆی كۆمه‌ڵ لێك بچڕا، هیچ نه‌زان ده‌بنه‌ده‌م راست.

*** خوا گوێز ده‌داته، بێ ددانان:**

– یانی زۆرشت هه‌یه به‌پێچه‌وانه‌وه دروست ده‌بێ.

*** خوا غه‌زه‌بی له‌داری گرت، ده‌یكاته چه‌قنه‌ی ئاشی:**

– واته مرۆڤ ئه‌گه‌ر تووشی به‌لابی هه‌ر هه‌نگاوێكی باویژی له‌وی تر خراپتره وئاخیری تووشی ده‌ردێكی خراپ دێت كه‌حه‌یای پێوه بچێ.

*** خوا ئاگای له‌مارو مێرووی هه‌یه؟**

– واته خوا ئاگه‌داری هه‌موو ئه‌وانه‌یه كه دروستی كردوونه له‌سه‌ر ئه‌م زه‌مینه .

*** خوا پیرت كا، له‌بیرت ناكا:**

– واته گه‌ر پیرو ره‌زیلیش بیت،به‌ڵام بێ رزق و رۆژیت ناكا.

*** خوا نایێ ببێته كێخوای تو:**

– واته خوا رێگای راستی به‌تۆنیشانداوه، تۆ سه‌ربه‌ستی جاچی ده‌كه‌ی.

* خوا هەموو دەرگەیەكی لەعەبدی خۆی پێوەنادا:

واتە گەرتووشی بەلاو كێشەونسیەت بی، بەڵام هەرنەجاتت دەدا.

* خوا یەكەو بێ شەریكە، پیاوی دووژن هەردەم خەریكە:

- واتە خوا تەنیایە، بەڵام پیاوی دووژن هەردەم كێشەی هەیە.

* خوا نینوكی درێژنەكا:

– واتە نەبێتە دەسەڵاتدار ئەو كەسە ئەگەرنا خراپ دەقەومێ.

* خوا ماڵی خۆی كاول ناكا:

– واتە تامرۆڤ لەخۆی نەگۆری خوالیێ ناگۆڕی، ماڵی كەسیش تێك نادات.

* خوا رەگی بەدكار لەبن دەردێنێ، تۆڵەی كارژۆلەی بێ شاخ ئەسێنێ:

– واتە حەقی كەس لەسەركەس ناهێڵی، چ زوو چ درەنگ.

* خوا بكەم قەت نەبوونی نەبینی:

– ئەمەیەكێك دوعا بۆ یەكێكی تر دەكا، چونكە نەبوونی زۆر خراپە

* خودا راستەو راستی خۆشی دەوێ:

– واتە خوا هەردەم لەگەڵ راستی وپاكی دایە.

* خوا تاسەران نەبینی، بەفری ناهاوێتێ.؟

– هەندێ كەس هەن تووشی بەلادێن‌و مستەحق بووینە بۆ ئەم بەڵایە، ئەوجا ئەم مەسەلەیە دەگوترێ.

* خوا حەقی بزنی بێشاخ، لەسەر بزنی بەشاخ ناهێڵی:

– واتە خوا حەقی كەسانی بی چارەو بێ دەسەڵات لەدەسەڵاتداران وەرئەگرێتەوە.

* خوا بۆ بەروش، كلاوی دروستكردووە:

– واتە خوای گەورە هەموو كەس دەبینی، ئەمەش لەكاتێك دا دەگوترێ كەپیاوێك لێی قەومابیو‌پێویستی بەهاوكاری بن.

* خوا رازیقە، بەڵام بێ نحم نابێ:

واتە هەرچەندە خوا رازیق بی، بەڵام كارو جولانەوەشی هەر دەوێ هەروەك گوتراوە (لەئاسمان بۆ كەس نەباریوە).

* **خوا دەردی داوەو دەرمانیشی داوە:**

– واتە ئەبێ لەکاتێکدا کەتووشی نەخۆشی ئەبێ بەدوای چارەسەر بگرێت.

* **خوای فەقیرانیش هەیە:**

– ئەوە لەکاتێکدا دەگوترێ،کابرایەك لێی قەومابی ئەمە دەڵێ.

* **خوا ئەگەر دەرگایەکت لێ بگرێ، سەد دەرگای تر دەکاتەوە.**

– واتە لەکاتی لێ قەومانی مرۆڤ نائومێد نەبێ وەئەگەر دەرگایەك بگرێ، سەد دەرگای تر دەکاتەوە.

* **خوا ئەگەر قاچی بەماردەدا، دونیایی دەخوارد:**

– واتە زۆر کەس هەیە دەسەڵاتی ببی دونیا دەخوات.

* **خوا ئەگەر شانسی بردێ ، سەی بەرد دەرگاشتی ناقڵ دەکات:**

– واتە ئەگەر پیاوشانسی چوو، سەگی بەردەرگاشی نارەوی ولەبەرسەگی خۆری هەڵدێ.

* **خواشتی دەوێ وخورماشی دەوێ:**

– واتە دەیەوێ دووشتی باش لەیەك ئاندا دەستی بکەوێ کەئەم دوشتەش لەوکاتەدا ئاسان نەبی.

* **خوا گەورەیە، گەورە بەزێنیشە:**

– یانی هەرچەند خوا خۆی گەورەیە،بەڵام زۆر گەورانیش لێ◆ەخات ،واتە خوا دووسیفەتی هەیە لەلایەك بەزەیی وروحمی زۆرە ولەلایەکیترەوە تورەیی‌و تێدا هەیە وتۆڵە لەزۆرداران وەرگرێتەوە.

* **خودا دەیزانی زمان ناوەستێ، بۆیە حەپسی کردو هاوشیتییە بەستێ:**

– واتە زمان بەلای سەرە، بۆیە خوا لەشوێنێکی باش شاردیتەوە.

* **خودا رەحیمە، بەڵام شەدیو لعقابیشە(یادەڵێن) خوا کەریمەو کریم ترێنیشە.**

– واتە بەهەردوو جۆر لەگەڵ مرۆڤ دەجولێتەوە.

* **خودا عومری نوحی پێدایە:**

– واتە خوا مەیلی لەسەر شتێك بێ دەبێ‌و مردن‌و کاریان لەدەست

ئەودایە.

* **خودا غەزەبی لەمیرو لەگرت باڵی پێدا:**

واتە خوا غەزەب لەیەكێك بگرێ، بەخۆشی نازانی چی بەسەردێ.

* **خودا لەسوڵتان مەحمود گەورەترە:**

– واتە لەكەس مەترسەوخوا دەسەڵاتی بەسەر هەمووان هەیە.

* **خودا هەتاو نیشانی ماری سڕ نادات:**

– واتە خۆی كاربەجێ یەو لەهەمووكەس بەتواناترو زیرەكترە.

* **خودای گەورە نە پێ بەمار بدە نەشاخ بەكەر:**

– ئەم لەكاتێكدایە مرۆڤێك بپارێتەوە كەكەسی شیاو بۆ شوێنی شیاوبێ

* **خوا ئێمەی رەنگ سروشت پێداوە، رەنگی هیچ كەسی بەكەس نەداوە:**

– ئەمەش نیشانەی لێهاتووی وباڵا دەستی یەزدان دەسەلمێنێ.

* **خوا رێ لەبەندی بەدكار بگۆڕێ، نابێتە سەر رێ تالێوی گۆڕی:**

– واتە بەندی بەدكار بەسانایی چانابێ، مەگەر هەرخوارو رحمی پێبكا .

* **خودا غەزەبی لەبزن گرت، نانی شوانی خوارد:**

– واتەیەكێ ئەنجەلی بێ، بەخۆی لەخۆی تێك دەداو تووشی بەلای لابەلادەبێ.

* **خوا بەگوناهی ، گوێمی نەگرێ:**

– لەكاتێكدا بەكاردێت گوێت لەقسەیەكی گوبهاری یان تاوانكاری بوبێت بۆ یەكێكی تر باس بكەی، واتە منیش ببیستوومە وئۆباڵی بەملی ئەوكەسەی كەبۆمی باس كردووە.

* **خوا پێوەی بخۆی، خواتێی گوشی:**

– بەشتێكی كەم دەوترێ، كەهەرچۆن بیری لێ بكەینەوە، بەش نەكات.

* **خوا خوایە، بزن سواری گایە:**

لەكاتێكدا دەگوترێ كەداد پەروەری نەبێ، كەسی ناكەس بەچەونەزان شوێنی باشیان وەرگرتبێ.

* خواشەریکی کردەیە:

– واتە یارمەتیدەری ئەوکەسانە دەبێت کەرەنجی شانو ئارەقی ناوچەوانیان نان پەیدا دەکەن.

* خوامالّ ئەدا بەجوولەکە، (ئەدا بەنێرەکەر):

– بەیەکێك دەلّێن کەشایەنی ئەوشوێنو پلەو پایەو دەولّەمەندیە نەبێ وبێ وبێ ماندووبوون بەدەستی کەوتبێ.

* بەکابرایەکی ناتێگەیشتی دەلّێن کەئیشو کارەکانی باش بۆ بەڕێوەچووبێ، بێ ماندووبوون دەولّەمەند بووبێ.

* خوا هەرگوتی (تیژ، تیژ):

– واتە خوا مەبەستی هەرچیەك بێت کونفەیەکونێك جێبەجێ دەبێ

* خوا ساترنەدا:

– لەکاتێك دەگوترێ کەیەکێك بەلایەکی تووش بووبێ دەلّێن هەر بەلایەکی گەورەتر نێ، دلّی دەدەنەوە.

* خوا تادەرەکێ نەکاتەوە، دەرکێ پێوەنادا

– واتە خۆی کارزانو دەسەلاّتدارە و دەزانی چی دەکا، هەمیشە بەزەییو شارەزاییە.

# (دونیا)... لە پەندی كوردیدا

دونیا بەو زەمینو كەونە دەگوترێ كەئێمەی ئادەمیزاد گیانلبەر تێدا دەژینو دەگوزرێنین، ئەو دونیایە پانو بەرینە بەجوانترین شێوە بۆ مرۆڤ دروستكراوەو وەك ڕایەخێك وایە بۆ ئەوەی بەسەریدا هاتووچۆ بكەینو تێدا خۆمان پێ تاقی بكەینەوە.

پەندی كوردی بەگەلی جۆرو شێوەو شێواز دەربارەی (دونیا) هاتووە، بەچاكو خراپو بە بەرزو نزم دەڕوانییە دونیا، ئێمە لێرەدا بەهەموو جۆرەكانیەوە باس لەو پەندانە دەكەین كەدەربارەی (دونیا) گوتراوە، بەئومێدین لەدنیایەكی پڕ لەخۆشیو شادیو بەختەوەریدا بنو ئەم پەندانەش ببنە ڕێ نیشاندەرو ڕێگای دنیاتان بۆ ڕۆشەن بكات. پەندە كوردیەكانیش ئەمانە كە (دونیا)یان تێدایە:

*** دونیا شامی شەریفە:**

– لەكاتێكدا بەكاردێ، كەووڵات لەئاشتی ئاسایشدا بێ كەس دەست درێژی نەكاتە سەر كەسو هەموو كەس بەئیشو كاری خۆیەوە خەریك بێتو كەس مافی كەس نەخواتو پێشێل نەكات.

*** دونیا بەئومێد خوراوە:**

– واتە دەبێ ئادەمیزاد گەش بین بێتو هیواو ئومێد بەرنەدا، هەمیشە وورەی بەرزبێتو بیر لەڕۆژو ئایندەی بكاتەوە.

*** دونیا پێچی مێزەرێكە"**

واتە دونیا هەر دەبڕێتەوە، بەڵام ئەوەی بۆ ئادەمیزاد بمێنێتەوە [illegible] چاكە.

*** دونیا پێنج و دوو رۆژێکه:**

– ئه‌و په‌نده‌ش وه‌کو ئه‌وه‌ی سه‌ره‌وه وایه، واته دونیا هه‌ر ماوه‌یه‌که‌و نامێنێ.

*** دونیا زاو مه‌رگه:**

– واته له‌دونیا هه‌یه ده‌بێ‌و هه‌شه ده‌مرێ، بۆ ئه‌وه‌ش به‌کاردێت که‌ئیشێك بۆ دوا رۆژ بکه‌ی.

*** دونیا ده‌فێکه وه‌ك ده‌فی ده‌روێش، هه‌ریه‌که ساتێ مه‌ژه نووش، په‌ی ویش:**

– واته ئه‌و دونیایه بێ وه‌فا هه‌ر رۆژی بۆ یه‌کێکه.

*** دونیا کوێر ده‌بۆوه، دوو سواریش له‌جه‌رده‌ی ده‌گه‌ڕان:**

– به‌که‌سانی دزو شڕه خۆره ده‌گوترێ، که‌به ته‌نگ لێ قه‌ومان‌و ناخۆشی خه‌ڵکه‌وه نین.

*** دونیا وه‌ك تاسی حه‌مامه، هه‌ر رۆژه‌ی به‌ده‌ست یه‌کێکه‌وه‌یه:**

– واته که‌س به‌دونیا نه‌نازێ‌و وه‌فایی بۆ که‌س نیه.

*** دونیا نموونه‌ی قیامه‌ته:**

– واته له‌و دونیا چ بچینی له‌دوا رۆژ ئه‌وه ده‌دوریه‌وه، چاکه‌و خراپه دێته رێت.

*** دونیای بێ وه‌فا کاروان سه‌رای را، نیوه به‌دڵ ته‌نگ، نیوه به‌دڵشاد.**

– واته خۆشی‌و ناخۆشی له‌و دونیایه هه‌یه‌و دێته رێگات، ده‌بێ مرۆڤ به‌رگه‌ی هه‌ردووکیان بگرێ.

*** دونیا توخمی ته‌ماحه:**

– واته له‌و دونیا مرۆڤ چاوی تێر نابێ‌و ته‌ماحی ده‌کا.

*** دونیا ده‌فه‌ن‌و دوفه‌نه:**

– واته چاکه‌و خراپه‌ی تێدایه، هه‌ر رۆژی به‌جۆرێکه.

*** دونیا ریشه‌ت کنیا:**

– واته که‌سانێك هه‌ن دونیایان له‌لا پیرۆزه‌و گرینگه‌و به‌هه‌ند وه‌ریانگرتووه.

* دونیای لەخۆی كردیە، بەكونەمشك.

بەكابرایەك دەگوترێ بەخەیاڵ دونیا لەخۆی تەنگ كردبێ.

* دونیای بێ سەر بەسەرانی نابێ:

واتە دونیا هەموو كێشەو ململانێیە لەنێوان هێز خێرخوازو هێزی شەڕخواز.

* دونیا هەموو بسووتێ، دەسکە پوشێکی تۆی تێدانیە.

– بەكابرایەك دەگوترێ لەئاژاوە شەڕو شۆڕو بگەڕێو نێوان خەڵك تێكبدا، ئەوەی پێدەڵێن.

* دونیای هەمووی دوژمنی سەری کەوە، کەویش دوژمنی سەری خۆیەتی:

– بەڕاستی وایە زۆر میللەت هەیە خۆ خۆرن بۆ گیانی خۆیان ئازان.

* دونیا بێتە پۆست، دوژمن نابێتە دۆست:

– واتە دوژمن هەر دوژمنەو نابێتە دۆست، کەواتە ئەو کەسە نەزانە بەقسەی دوژمنی بکات، یا کاریان بۆ بکا.

* دونیا بەردق، بەردقە، پێی ناوێ ئەم لەقە لەقە:

– واتە دونیا هەورازو نشێوی تێدایە، کەواتە خۆت سەر غرەت مەکە.

* دونیا پردەو خەڵکیش رێ گوزار:

– زۆر راستە هەر رۆژە یەکێکە ئەسپی خۆی تاو دەداتو خەڵك لەژێر پێی خۆی دەشێلاو بەسەریدا تێدەپەڕن.

* دونیا بەبا دروست بوەو بەباشی خراپ دەبێ:

– ئەوە لەکاتێك دەگوترێ کەبایەکی زۆر بەهێزبێت.

* دونیا ئنگوستیلەیە کەبەهەوەسی خۆی دەیسوڕێنی:

– بەیەکێك دەڵێن ریشەو جلەوی کار بەئارەزووی خۆی گورج و شۆڕ بکات.

* دونیا جوولە جوولیەتی، موختار قوونە قوونیەتی:

واتە رۆژگار بەرەو پێشکەوتن دەڕوات، کەسانێکیش پاش کەشە دەکەن.

* دونیا چەمە، هەموو شتی تێدایە:

-واتە کۆمەڵ چاك و خراپی تێدایەو تێدا دەبێت.

* دونیا دەوران دەورانە، چەرخ و فەلەکە دەسورێ.

- واتە ئەمڕۆ بۆ تۆیە بەیانی بۆ یەکێکی تر:

* دونیا کەرە، سواری بەهەورە.

- ئەوەندی گوێ بەم ڕۆژگارە مەدە بەئارەزووی خۆت بکە.

* دونیا گوڵێکە هەردەم لەچەشنێکە:

- واتە هەڵس و کەوتی مرۆڤ لەگۆڕان دایە، بەگەش بینی بێت یارەش بینی.

* دونیا لۆ دونیایە:

- واتە چەندم لۆ ببیت، ئەوەندەت لۆ دەبمەوە.

* دونیا لۆیی خۆشە، بێ دەرکەیە:

- واتە مرۆڤ دەیەوێت بەئازادی بژی.

* دونیا دوو دەرکەیە، لەوەی دێ لەوەی دەچیتە دەرێ:

- واتە مردوم هەرچەندە بژی هەر هیچ لەم گێتی‌یە نازانێت.

* دونیا دەیەوێ. قیامەتیش دەیەوێ:

- واتە بەهەردوولایان کەمتەرخەم مەکە.

* دونیا بە پووش نەگیرایە:

- بەکەسێکی تەنگەتاو دوو دڵ دەگوترێ.

* دونیا بنی زۆر قوڵە:

- واتە دونیا دوورو درێژەو کاتی دیاری کراوی بۆ دیار نیە.

* دونیا خەون و خەیاڵە، بەدوا کەوتنی خەون و خەیاڵیش بەتاڵە:

واتە نابێ زۆر بەگرنگی وەریبگرێ.

* دونیا دەوران دەروانە:

- واتە هەر ڕۆژێ بەجۆرێکەو بۆ بەرژەوەندی‌و سودبینینی کەسانێکە.

* دونیا هەتاسەر بۆ کەس نییە، کەچی خەڵك ئەوەندە لەدووی شەقییە:

- واتە هێندە ناهێنێ، کە دڵی ئەم‌و ئەو بشکێنی خۆت لەیاد بکەی.

* دونیا یا زالم دیەخوا یا بێچار:

- واتە كەسانی دەست ڕۆیشتوو بەهێز سوودی لێ دەبینن.

* دونیای بەهەردوو دەستەوە گرتییە:

- واتە چاكەو خراپەی تێدا ئەنجام دەدا.

* دونیای بەو ڕووناكییەی لێ تاریك بووە:

- واتە ڕەش بینەو دڵتەنگو غەمبارە.

* دونیا سێبەرە، دوای كەوت دەڕوا، كەڕووت وەرگێڕا ئەوت دێ لەدوا:

- واتە هێندە ڕاكەڕاك مەكە بەدواییدا.

* دونیا بازاڕی كڵاو دروانە:

– واتە ئەوانە كڵاوچیو درۆزنو فێڵبازن دەبەنەوە لەم دونیایە.

* دونیا كەرە كووی بازۆی وەدە ڕوا:

– واتە خۆت هیلاك بكەی بەئامانج دەگەی.

* دونیا چەمە:

– واتە چاكو خراپی تێدایە.

# (شەو و رۆژ)... لە پەندی کوردیدا

ساتەکانی ژیان بریتییە لەبیست چوار کاتژمێری شەو و رۆژ، هەریەکەیان کۆتایی بەوەی تردێنێت، کەچی سەر لەنوێ سەرهەڵدەدەتەوە، بەوەرزەکانی ساڵ کورتو درێژی شەوو رۆژ دەگۆڕدرێت، جگە لەوەش هەر وولات و ناوچەیەك بەجۆرێك دابەشکراوە، بەهەرحاڵ ئەوەی ئێمە گەرەکمانە دەربارەی ئەو پەندە کوردییانەیە کە ووشەی (شەوو رۆژ)ی تێدایە، پەندەکانیش ئەمانەی خوارەوەن:

*** شەو قەڵای ، مێرانە:**

– واتە شەو بۆ پیاوی ئازاو تۆڵەسێنەوەباشە و جوامێری بەدیاردەکەوێ.

*** شەو ستاری بەنەیە:**

– شەو بۆ پێشوودانو نوستن هاتیە.

*** شەو گوێدارە:**

– واتە خەڵك گوێ دەگری، پێویستە لەسەرخۆ قسە بکەی تاکەس لەقسەکانت نەگات.

*** شەوهات و مەرگ هات:**

– یەکێکی نەخۆش ئەم پەندە دەڵێ کە کاتی لێ نەڕوا.

*** شەوگاری شووم، لەئێوارەوەدیارە:**

– واتە هەموو ناخۆشی وکارێك لەسەرەتاوە دیارە.

*** شەوی خۆشی لەئەنگۆرەوە دیارە:**

– واتە هەمووکاری لەپێشەکیەکەیدا بەدیار دەکەوێ

*** شەو دەنوێ بەجلی گایە، بەرۆژ دەڵێ قوچ وپاشایە.**

– بەیەکێك دەڵێن لەماڵی چی نەبێ، بەڵام لەلای خەڵك واخۆی نیشان بدە کە هەبوونە.

* **شەوی جەژن، فەقیریش دەوڵەمەندە:**

– واتە بۆ جەژن هەژارو دەوڵەمەند خۆیان بۆ ئامادە دەکەن، چێشتی خۆش لێ دەنێن.

* **شەو یەك و دز هەزار:**

– بەچەند کەسێك دەوترێ کەهەموولەیەك شت دزی بکەن، هیچیان ئاگایان لەیەکتر نەبێ.

* **شەو و رۆژ دێ و دەڕوا بەلای خودا خلاس نابێ:**

– واتە کێشەوبەلا بەدەست خوایەو لەبەندە نزیکە و زۆرە.

* **شەو لۆچاوانە، رۆژلۆ دلانە:**

– واتە هەرشتێ لەکاتی خۆی خۆش و پێویستە.

* **شەوی تاریك ، رۆژی رووناکی لەدوا دێ:**

– واتە پاش هەرناخۆشیەك، خۆشیەك هەیە، پێویستە مرۆڤ گەشبین بێت

***بەرۆژ دەروێشە ، بەشەو دەروێش مەبە.**

–واتە بەرۆژ کاروکاسبی بکە، بەشەو پشوو بدە.

* **رۆژان، رۆژیان لەشوێنە:**

– بەیەکێك دەڵێن بیر لەپاشە رۆژ نەکاتەوە، واهەست بکات هەرلەخۆشی دەژی.

* **رۆژ بووە بەساڵ، ساڵ بووە جەواڵ:**

– واتە رۆژگار درێژ بووە، مەردوم هەربەوە رادەگات کەنان بخوات.

* **رۆژی نەفسی نەفسییە، کەس ئاگایی لەکەس نییە.**

– بەرۆژێکی ناخۆش و پڕ لەچەلمە دەگوترێ کەکەس بەکەس نەبێ.

* **رۆژی بارانان قوڕە:**

– دەبینی رووداوێك روودەدات، لەم پێناوەدا هەندێ شت روودەدات

كەنەدەبوایە بكرێ.

* **رۆژ دەڕوا قەزاو بەلای دونیا نارِوا.**

– واتە كارەساتی سامناك و چاوەنوار نەكراوە هەموو دەم لێتەوە نزیكە .

* **رۆژ لەرۆژئاوا هەلات:**

– بەكارێكی پێچەوانە دەڵێن.

* **رۆژ هەرات، ئاوادەبی:**

– واتە هەمووكاروشتێ كۆتایی هەیە.

* **رۆژ لەكەرخەك ئاوانابی:**

– واتە هەمووشتێ قابیلی گۆڕانە.

* **رۆژی بمری حەفت زاوا، كورم نابی ساوا:**

– واتە زاوا نابێتە شوێنەوارو بەنەمانی ماڵت لێتكناچێت.

* **رۆژی لەجێگیایەكی خراپ لیٚ ئاوابوو:**

– واتە خراپی لیٚ قەوما.

* **رۆژ لەكام لا هەراتیە:**

– بەكارێك دەگوترێ كەكەسێك بیكات ، پێشتر ئەم كارەچاكەی نەكردبێ

* **رۆژ بە پە نجەی دەست دەژمێری:**

– بەیەكێك دەڵێن چاوەڕوانی شتێك بێت.

* **رۆژ دیارە پە نجەی ناوێ:**

– بەشتێك دەڵێن روونو ئاشكرابێ، پێویست بەبەڵگەناكات.

* **رۆژ هەڵات، هەموو ورات:**

– واتە خراپە هەمووڵایەك دەگرێتەوە.

* **رۆژێك بەكەلە شێری، نەك هەزار رۆژ بەمریشكی ، یادەلێن رۆژێك بـە سـەربەرزی، نەك سەدساڵ بەژێردەستی.**

– واتە پیاو مەردبیو بەسەربەرزی بژی، لەژێر باڵی كەس نەبیٚ .

* **رۆژی هەلە هەلیٚ، بەرخ دەچێتەوە بەرمەرِیٚ:**

– واتە لەكاتی شەڕو تەنگاوەدا خزم پشتی یەكتر دەگرن.

# (زێــــڕ)... لە پەندی کوردیدا

لەسـەر ئـەم زەمینـە پـانو پـۆڕەدا گـەلێ شـتی بـەنرخو پڕبـەها هەیـە، کەدەبێتە مایەی ئارامیو جوانیو خۆشبەختی مرۆڤ، (زێـڕ)یش یەکێکـە لەکایـە بـەنرخو بەناوبانگـەکانی دونیـا، کەلـە مامەڵـەو سروشـتی جـوانی بەکاردێت، ئادەمیزاد زۆر کەیفی بـەزێڕ دێـت، بەتایبـەت ئافرەتـان کـەبۆ زیـاتر دەرخسـتنی جوانیەکـەیان بەسـەر خۆیانـەوە دەکـەن مـن لێـرەدا نامەوێت سودو زیانەکانی زێـڕ باسـبکەم، وەلێ ئـەوەی گەڕەکـە ئامـاژەی پێبکەم دەربارەی ئـەو (پەنـدە کوردیانەیـە) کەووشـەی (زێـڕ)ی تێدایـە، بەئومێدم پەندەکانیش چەشنی زێڕ سودبەخشو بەدڵتان بێت :

* **زێڕ بەقیمەتی خۆی، زیویش بەقیمەتی خۆی.**

– واتە شتی چـاکو خـراپ، هەریەکـە بـەهای خـۆی هەیـە، کەواتـە نـابێ بەیەك چاو سەیری شتەکان بکەین.

* **زێڕ دەرێ هەرمگرە، زیو دەرێ بەخۆم وەکە.**

– واتە زێڕ بۆ ڕۆژی تەنگانەو لێقەومان پارە دەکات بەکەڵك دێت واچـاکە هەڵی بگری، زیویش بۆخۆ دیارخستن باشە.

* **زێڕ پاك ژەنگ هەڵناینی.**

– پاكو ڕەسەنو چاکە، هیچ شتێ کاری تێناکات.

* **زێڕی پاك لەئاگر ناترسێ یادەڵێن (زێڕی کە پاکە چ منەتی بەخاکە)**

– واتـە بـێ منەتـەو لـەهیچ شـتێ سـل ناکـاتو، کاریگـەری هـیچ شـتێ بەسەریوە دیارنابێ.

* **زێڕ لەلای زێڕینگر بەقیمەتە. یادەڵێن (قەدری زێر لای زێڕنگرە)**

— واتە ئەوپیێوەی ماندو هیلاك دەبێت، دەزانێ چۆن دروست دەکرێو بەکاردێت.

* **زێڕم داوە، بەڵام فڕیوە. یادەڵێن (زێڕم دا، بەڵام کڕی)**

— واتە هیچ سوودم لێ نەدی.

* **زێڕ گچکەش دەبێ، یادەڵێن (زێڕیش گچکە یە.**

— واتە مەرج نیە هەرشتێ بچوك بێ، گرینگو پڕبەهابێ، بەپێچەوانەوە، زێڕ بچوکەو نرخی خۆشی هەیە.

* **زێڕ دەگرێ لەدوکانان دەرێ دەکەوەمە دەستی نەزانان. یا دەڵێن (زێڕە زەردی زەمانە، دەگرێ لەبەر دواکانا، دەرێ دەکەومە دەست قەدر نەزانا).**

— واتە کەسانێك هەن دەوڵەمەندنو خواپێداون نازوفیز بەزێڕ لێدەدەنو قەدری زێڕەکە ناگرن، لەوکاتەدا ئەو پەندانە دەڵێن.

* **زێڕ بوینە پولەکە، مێرد بوینە جولەکە.**

— واتە لەوکاتەی زێڕ نرخو بەهای تەواوی خۆی نامێنێو زۆر دەبێ، کەسێتی پیاو لای هەندێ ئافرەت کزو لاواز دەبێت، ئەم پەندە دەگوترێت.

***کاسبی بازنی زێڕی دەستی مرۆڤە.**

— واتە گەر ئیشو کاربکەیو تێبکۆشی، ئەوە خوا زێڕوماڵو سەروەتو سامانت دەداتێ، پێویستت بەکەس نابێت.

* **بێوەژن نەستوندەی ناومالی زێڕ بێ، خێری پێ دەشێ.**

— واتە بێوەژن لێقەوماوەو کەسینیە کاری بۆبکات، لەوکاتەدا ئەو پەندە دەگوترێت.

* **زێڕ لەقوڕیشدابێ دیارە.**

— بەژنی جوانی هەزار دەوترێتن، واتە هەزارجار ڕەشو ڕوت بێت جوانیەکەی هەر دیارە.

# ( پـــــارە )... لە پەندی کوردیدا...!!

پارە... پێویستیەکی ، خۆشی بەمرۆڤ دەبەخشێ، پێداویستیەکانی بۆ دەستەبەردەکات بەڵام نابێتە سەرچاوەی بەختەوەری، لێرەدا هەوڵ دەدەین ئەوپەندانەی لەسەر پارەگوتراوە بخەینە ڕوو:

*** پارە بەرد نەرم دەکا**

واتە بەپارە هەموو کەس نەرمو نیان دەبێ، واتە پارە ڕێ خۆشکەرە بۆ ئەنجامدانی هەموو کارو کردەوەیەکو ڕازی کردنی دڵی بەرامبەر گەر ڕەقیش بێ، جگە لەوەش ئێستا بەهۆی پارەوە شاخەکان وێران دەکرێ، مەبەست ئەوەیە کاری زۆر گران هەیە بەپارە پێکدێت.

*** پارە بدەو مەلا لەمزگەوت دەربکە :-**

واتە، یانی مەلا هەرچەندە مزگەوت بەماڵی خواو خۆی دەزانی ئاسان نییە دەرکردنی لەمزگەوت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پارە کاریگەری خۆی هەیە، لەوانەیە دڵی بگۆڕیو بەدەرکردنی بداتو زۆر شتی لەبیر بچێت، ئەمە وەنەبێ هەر بەقسە بێ، بەکرداریش ڕووی داوە.

*** پارە دین دەبە، دین بەرە:**

واتە بەپارە چاکەش دەکرێ هەر بەپارە خراپەش دەکرێ کەواتە ئەگەر چاکەت کرد ئەوە دینو ئیمانت بڕوات پتەو دەبێ خراپەش پێچەوانەکەیەتی.

*** پارەت هەبێ کەس ناپرسی کوڕی کێی؟**

واتە پارە عەیبو عارت دادەپۆشێو کەس ناکەس بەچەش دەکا بەکەسیو کەس لەئەسلو نەسەبت ناپرسێ کەمو کوڕیەکانیشت دادەپۆشێ: خەڵک لەدەورت کۆدەبێتەوە

* **پارە بۆ نامەرد، روو زەردیی دێنێ:**

– چونكە لەوشێن خۆی خەرجی ناكا.

* **پارە پارە دەهێنێ:**

– واتە بەبێ پارە كەسابەت ناكرێ

* **پارە چلكی دەستە:**

– واتە: خەرج دەبێ و دەڕوا

* **پارەی خەلك، كیسە دەدڕێنێ:**

– واتە: شتی خەڵكی چ سوودی نییە، وەك دەڵێن سواری خەڵ:ی پیادەیە.

* **پارەی زۆر سەر شۆڕیی دێنێ:**

– واتە پارە دار لەبەرئاگاداری پارەكەی، ناوێری لەشوێنی خۆیا نەقسەیەكی پیاوانە بكاو نەكارێكی مەردانە بنوێنێ.

* **پارەی چەرمگ، بۆ رۆژ رەش:**

– وەك ئەوە پەندەوایە كەدەڵێ (ماڵی سپی، بۆ رۆژی رەش) واتە بۆ كاتی لێقەومان باشە

* **پارەی چەرمگی پێداوە، جق بكە خق بكە هەر دەیخوات:-**

–واتە یەكێك بەشتێك زۆر ماندوو ببیو كۆسپی زۆر دروست بیو خەڵك پێی بڵێن وازی لێبێنە، ئەویش وازی لێناهێنێ ئەو مەسەلەیە دەڵێ.

* **پارە لەتازە كیسە قەرز مەكە، گەر قەرزت كرد خەرجی مەكە:-**

–تازە كیسە: تازە دەوڵەمەند: واتە چونكە تازە پیاكەوتووە، زۆر زوو داوات لێ ئەكاتەوە، وەدەبێ بیدەیتەوە.

* **پیرەمێردی شاعیریش لە پەندێكی خۆیدا دەڵێ:-**

**ئەگەر لە پارەی خەڵكی بپرسی**

**چاوت تێر نابێ تائەمری برسی**

–واتە نابێ چاوت لەپارەو ماڵی خەڵكی بێ، گەر وابی هیچ ئیشو كارو كردەوەیەكی باشت پێ ناكرێ، وای لێدێ لەداخانا دەمری، دەبێ مرۆڤ سوپاسگوزاری یەزدان بی بەوبەشەی كەپێی دەدا ڕازی بێ.

# ( پیاو ) ... له پەندی كوردیدا

یەزدانی دلۆڤان‌و مەزن یەكەم گیانلەبەری كە دروست كردبێ بۆ سەر ئەم زەمینە پان‌و بەرینە، ئەوە مرۆڤ بووە، لەمرۆڤیشدا پیاو بووە، كەواتە گرینگی‌و تایبەتمەندی خۆی هەیە، دەبێ ئەو راستیە بزانین هەموو نێرێك پیاو نییە، بەلام هەموو پیاوێك نێرە كوردە هەر لەدێر زمانەوەو لە بەرەبەیانی مێژووەوە پیاوی مێرخاس‌و جوامێرو قارەمان‌و چاونەترس‌و ئازای لێهەلكەوتووە، كەتوانیویەتی بەرەنگاری سەرجەم كێشە لابەلاكان‌و كۆسپ‌و تەگەرە ناخۆشەكان بێتەوە بەسەریان زالبێ، باب‌و باپیرانمان بەهەموو كەسێكیان نەوتووە پیاو، بەلكو ئەوانەی پیاوەتیان لەدەست هاتووە وسەخاوەت‌و دلفراوان‌و چاكە كەرو نان دەربوونە ئەمانە بەپیاو لەقەلەم دراون، ئەوەی ئێمە گەرەكمانە لێرەدا باسی بكەین دەربارەی ئەو پەندە كوردییانەیە كە دەربارەی (پیاو) گوتراوە بەچاك‌و خراپەوە یا بە هەر جۆرێ بێ، پەنەدەكانیش ئەمانەن:

* **پیاوی بێ چارە، بەدۆستی داكی دەڵێ بابە:**

- واتە: یەكێك بۆی نەگونجێت تا هەلی ب ۆدەركەوێت بەخراپەكار دەلێت هاوڕێ.

* **پیاوی بێ غیرەت خۆی بەقوربانی ژنان كا.**

- واتە ژن لەپیاوی دەست نەكەرەوە باشترە.

* **پیاوی فەقیركوفربكا، خوانانی دەبڕی، پێغەمبەر دۆ.**

واتە: هەژار لەدلی بەزار لەشتێكی كەم‌و بدوێت دونیای لێ دەبێ بەئاگر و ڕەنگر.

* **پیاوان دەبرد لۆ نیعدام كردنێ، ژنی دەعوای مۆری‌و مەرجانی دەكرد.**

– واتە : ژنی خراپ لەناو چوونی مێردی ئاپێچێنەوە، لەبەرژەوەندی خۆی دەدوێ.

* **پیاوی لەکاتی رق هەڵسان رکی نەگری**

– واتەئەگەر مرۆڤ هەڵساو توورەبوو هیچ کارێکی ناشایستەنەکاتو خۆی بگرە پاش ماوەیەك دێتە سەرخۆ، لەکەلی شەیتانی دێە خوارێ، توورەییەکەی لەناو دەچیو تووشی بەڵا نابێ.

* **پیاوی قەردار زمانی کورتە.**

– واتە پیاو ئەگەر قەرداری کابرایەك بی لەهەر روویەکەوە ،هەمیشە چاوپۆت و زمان کورت دەبی بەرامبەری .

* **پیاوکەمرد لاقی رادەکێشێن:**

– واتە: زۆر راستەو جاروایە لەکاتێك دادەڵێن کەپیاو ئەگەر گیروگرفتێ روویدا شتی تریش روودەدات.

* **پیاو کە ناچار بوو سەربەماڵی دوژمنی دادەگرێ.**

واتە لەکاتێکدا دەگوترێ کابرایەك روولەکابرایەكو ئەمەش دەڵێ لەلای برادەرانی خۆی.

* **پیاو ئەو پیاودیە بەباڵی خۆی بفرێت نەك بەباڵی خەڵ:ی.**

واتە: پیاو پێویستە بەدەست و قامی خۆی پێبگاتو تێبکۆشێو بگاتە خۆی پێبگاتو تێبکۆشێو بگاتە ئەنجام نەك بەئەمو ئەو.

* **پیاو ئەو پیاودیە بەچاکە پیاوبێ، نەك بەوەزیفە ناوی بەناوبێ.**

– واتە: پێویستە پیاو چاکە بکاتو پیاوەتی بنوێنێ، نەك بەکورسیو کاری شانازی بکات.

* **پیاو ئەو پیاودیە کەلك لەبەسەرهاتی خەڵك وەربگرێ نەك لەبەسەرهاتی خۆی وەربگرێ نەك لەبەسەرهاتی خۆی.**

–واتە: پێویستە سوود لەهەڵەو کارەکانی کەسانی تر وەرگری نەك بەسەرخۆشی بێ.

* **پیاو ئەو پیاودیە لە پشت ورووبەك بێت.**

–واتە نابێ بەرامبەرت جۆرێك بێتو لەپاش ملەش جۆرێکی تر.

* **پیاو نەمرێت ب هەموو ئاواتێك دگات.**
- واتە: پیاو بەهەوڵ وتێکۆشان دەتوانێ بەئاوات و ئامانجەکانی شادبێ.
* **پیاو سەردەدۆرێنێ، بەلام قسە نادۆرێنێ.**

واتە: پیاو پێویستە خودان قسەو بەڵێنی خۆی بێ و پاشگەز نەبێتەوەز گەرسەریشی تێ بچێ.
* **پیاوەتی بەئیشە نەك بەریشە.**
- واتە: سیماو روخسار پیاوەتی و جوامێری ناسەلمێنێ، بەڵکو ئیش و کرداربوونی پیاو و پیاوەتی دەسەلمێنێ.
* **پیاوی پیاوانە هی مەیدانی شێرانە:**
-واتە مرۆڤ پیاوانەو شەرم لە خۆکەرەوە هی ئەوەیە لەرۆژگاری تەنگانە پشتی پێ ببەستی ولە هانات دێت.
* **پیاو بێ کەس بێ هەژار دەبێ، ژن بێ کەس بێ هار دەبێ.**
-واتە: زۆر راستە ئافرەت بێ کەس و خاوەن بێ تووشی زۆر شتی خراپ دەبێ، پیاویش تەنیا هەژاردەبی، بەلام کەمتر تووشی ئیشی خراپ دێت.
* **پیاو ئەگەر تفی رووکردە عەردی هەڵی ناگرێتەوە.**

واتە: پیاو ئەگەر بەڵێنی دا نابی پەشیمان بیتەوەو دەبێ یەك قسەبێ.
* **پیاوی پیاوکوژ گوێچکەی قیتە.**
-واتە یانی ئەوەی دەست بکاتەوەو زەلام بکوژی گوێیەکانی قیتن و هەمیشە کابرا وشتەو ئاگای لەخۆیە وەك پشیلەی جووچکە خۆر.
* **پیاوی بێوەفا کە پری بۆبکەی ، یا کە پری لێ بسوتێنی هەروەك یەکە.**
- واتە پیاوی بێ وەفا هەرچی بۆبکەیی و هەرچی لەگەڵ بکەیت هەروەکی یەکە.
* **پیاو ئاقڵ بێ تەمەنی کەمە، پیاو راست بێ تەمەنی کەمە.**
-واتە: لەبەر ئەوە تەمەنی کەم دەبێ چونکە لەلایەك غەم زۆر دەخوات، لەلایەکی تریش لەوانەیە بیکوژن و لەناوی ببەن، چونکە ژیرو راستە.
* **پیاوی بێ ژن هەسپی بێ هەوسار**
- واتە تەواوکەری ژیانی تەواونیە، بەتنیا هەمووشتێ پێناکرێ.

* **پیاومان پۆپنن، تیره‌ نگێون ژنن.**

–واته‌ هه‌ردووكیان به‌یه‌كه‌وه‌ جوانن.

* **پیاوی بێ كه‌لك به‌نه‌بووی حیسابه‌.**

–واته‌: پیاوێك سوودنه‌بوو، هه‌رنه‌بێ باشتره‌.

* **پیاوی پیاو، پیاوه‌تی له‌بیر ناكا**

– واته‌: گه‌ر یه‌كێ: پیاو بوو، ئه‌وه‌چاكه‌ی له‌به‌رچاوده‌بێ.

* **پیاوی ترن، داری بێ به‌ره‌**

– واته‌ هیچ سوودی لێ نابینی

* **پیاوی عه‌وللا سرێمانم، گێلمه‌ گێلمه‌ نازانم.**

– به‌یه‌كێ ده‌گوترێ به‌یه‌كێكی تر خۆی هه‌ڵكێشێ‌و بێ منه‌ت بێ.

* **پیاوی نه‌گبه‌ت به‌رامبه‌ر خێر كوێره‌،**

– واته‌: چاكه‌ی له‌ده‌ست نایێ

* **پیاو پیاوی ده‌خوارد**

– واته‌ كه‌س به‌كه‌س نه‌بوو.

* **سه‌گ نان بده‌ پیاوی سپله‌ نان مه‌ده‌.**

– واته‌: چونكه‌ سه‌گ وه‌فایی ده‌باڵبه‌ڵام پیاوی سپله‌ وه‌فایی نیه‌.

* **پیاو ئه‌و پیاوه‌یه‌ له‌ته‌نگانه‌ خۆی نه‌گۆڕی**

– واته‌ له‌خۆشی‌و ناخۆشی له‌یه‌ك ئاست دابێ.

* **پیاو قسه‌ی خۆی به‌جێهێنا شێره‌، به‌جێی نه‌هێنا چێره‌.**

– واته‌ پیاو به‌قسه‌ به‌لێنه‌كانی بوونی خۆی ده‌سه‌لێمنێ

* **پیاو ئه‌و پیاوه‌یه‌ له‌قسه‌ی خۆی په‌شیمان نه‌بێته‌وه‌.**

– واته‌ كه‌قسه‌ی كرد ته‌واو

* **پیاوی مه‌رد خه‌نجه‌ری ده‌بان نایبڕێ.**

– واته‌ له‌هیچ شتی باكی نییه‌.

* **پیاوبه‌و قسه‌كیش بۆ خودا بكه‌.**

– واته‌ چی راسته‌ ئه‌وه‌بڵێ.

* **پیاو لغاوی بۆولاغ داهێنا. ئافره‌تیش بۆ پیاو.**

– واته‌: پیاو به‌قسه‌ی ئافره‌ت ده‌به‌سترێته‌وه‌.

* **پیاو دڵسۆز بێ بۆ هەمووکەسیش دەرگای کراوە بێ لەدز ناترسێ**

— واته: کەس دژایەتی ناکا.

* **پیاوەتی پیاوی پیاو بێ بەش دەکا**

— واته: دەوڵمەند نابێو پیاوەتی بەماڵەکەی دەکا.

* **پیاوەك بەگەورەیی فێرە پڵاو خواردن، بوبێت دەست بۆ کە پووی دەبات.**

— واته: شارەزانابێ

* **پیاوەك گورگ خواردیتی باوکیشی دیارنییه.**

— واته: کەلێ قەوما کەس بەهانای نایت

* **پیاوی باش ئەوەیە بەسەر ئارەزووەکانیدا زاڵ بێت.**

—واته بتوانێ کۆنترۆڵی خۆی بکا

* **پیاوی بچووك لای وایه کەشتی بچووك بایەخی نییه.**

— واته کەس عەیبی خۆی نابینی

* **پیاوی درێژ عەقل لەچۆکیتی**

— واته درێژی باش نیه

* **پیاوی زۆربلێ بۆ دۆزەخ بەرە. لەوێشدا دەلێ دارەکەی تەرە.**

— واته: هەرقسەی خۆی دەسەلمێنێ

* **پیاوی زانا یەك قسەی بەسه؟**

— واته زوو تێدەگات.

* **پیاوی عاقڵ کاغەزی سپی دەخوێنێتەوە.**

— واته ژیر لەهەموشت تێدەگات

* **پیاوی قەردار بەپەلە لەبازاڕ تێدەپەڕێ.**

— واته: خۆی دەدزێتەوە

* **پیاوی ماندوو بۆگێرو گرفت دەگەرێ.**

— واته: دەوێت خۆی دەربازکانو بیانو دەبینێتەوە

* **پیاوی هەیە لەئافرەت ئاوس ببێت .**

— واته: ئافرەتەکە زۆر دەردی دەداتێو غەمی لێ دەخوات.

* **پیاوی وام دیوە بۆنانو کەباب، کەوتۆتە زەمی مام و خاڵ باب.**

واته پیاو هەیه بەماڵی دونیا دەگۆڕێ و خزمو کەس بەلاوە دەنێ.

# ( ژن )... لە پەندی کوردیدا

ئەوەی گەرەکمە رۆشنایی بخەمە سەر ئەو پەندە کوردیانەیەی کە لەسەر (ژن) گوتراون چ بەچاك چ بەخراپ، لەوانەیە هەندێکیان بۆ ئەو قۆناغو سەردەمە دەست نەدەن، بەڵام پەندی کوردی لقێکی سەرەکی فۆلکلۆرەکەمانە نابێ خۆمانی لێ بدزینەوە، بۆیە گشتیان دەخەمەڕوو.

*** ژن هەیە ژنۆکەش هەیە:**

کورد لەسەرەتاوە ژنی پۆلین کردووە بۆ دوو جۆرو بەش، بەشێکیان هەر بەناو ژنەو هیچ رۆڵی نییە لەنێو کۆمەڵو کۆمەڵگا، بەکەڵك ماڵو خێزان نایێت، جۆرەکەی تریش پێچەوانەی ئەمەیە.

*** ژنی چاك ژیانە، ژنی خراپ ژانە:**

ئەم پەندە کوردیە وەسفێکی چاکە بۆ ئافرەت، واتە ئەگەر چاك بوو ئەوە هەموو ژیانە، خۆشترین شتەن چاکترین کەسە، بەڵام خوانەخواستە ئەگەر وانەبوو ئەوە دەبێتە ژانێك ژیانت لێ تێك دەدات.

*** ژن پیاوی ددکاتە پیاوو لە پیاوەتیشی دەخات:**

ئەم پەندەش هەر دەربارەی چاكو خراپی ژن گوتراوە، گەر ژنەکە باش بوو و پشتگیری پیاوەکەی کرد ئەوە باشە، گەر نا پیاوەکەش وەکو خۆی لێدەکات.

*** ژنی شەرمن شارەکی دەینی، پیاوی شەرمن شەیەکی نایینی:**

واتە گەر ئافرەت بەڕەوشتو داوێن پاكو بەشەرەف بوو ئەو هەموو دنیا دێنێ، پیاوەکەش دەبێ چاوکراوەو چوست بێ.

* ژن پرسی پێبکە، بەڵام وەك نەڵقە لەگوێی مەکە.

ژن وەك هاوبەشی پیاوو دایکی منداڵانە، پێویستە پرسی پێبکرێ، بەڵام نابێ دەوڕاستی ماڵ بێ، پیاوەکە چی لەدەست نەمێنێ.

* ژن ئەگەر ئەخشینە، ماڵی ڕەنگینە:

واتە ئافرەتێك کارزانو کابان بێ، ئەوە ماڵەکەی جوانو پاكو ڕەنگین دەبێ.

* ژن بەشەوێك دەبێتە مەلاژن:

زۆر راستە کاتێ ئافرەتێکی شوو بەمەلایەك دەکات پێی دەڵێن (مەلا ژن) بێ ئەوەی هیچی خوێندبێ، زۆر کەسە هەیە بێ ئەوەی ماندوو هیلاك بن ڕۆڵی لێپرسراوێتیو...هتد دەبینن!!

* ژن ژنی مێردان بێ، با لەبن بەردان بێ:

ئەم پەندە زیاتر ئافرەت بەکاری دێنن، واتە گەر پیاوەکە پیاو بێو بەدڵی ژنەکە بێ، با شوێنەکەی ناخۆشو یا کابرا هەژار بێ، گرینگ ئەوەیە ژیانیان خۆش بێ لەگەڵ یەکتردا.

* ژن ئەگەردایە بێ شەرمی، پێی دەڵینگی دەردینی:

واتە خوانە نەخواستە گەر بێ حەیایی کرد ئەوە کەس دەرەقەتی نایێ.

* ژنێك نۆزدە مێردی کردبوو، بەژنێکی تری دەگووت هەردووکیان بیست مێردمان کردووە:

واتە: زۆر خەڵك هەن خۆیان عەیب دارو خراپن دەیانەوێت خەڵکی تریش بهێننە ڕیزی خۆیان.

* ژنی ژنانە، داینێ لەدیوەخانە:

واتە ئەگەر ژنێ لێهاتوو بوو توانایی هەبوو ئەوە دەتوانی زۆر زیاتر لەپیاو ڕۆڵ ببینیو بێ ترس کاری بدەرە دەستو لێی مەترسە.

* ژنی بێ شەرم، وەکی چێشتی بێ خوێیە:

واتە دەبێ ئافرەت بەحەیاو بەشەرم بێ، گەر شەرمو حەیای نەما لای خەڵك سووكو بێ تام دەبێ.

* ژن بۆ شەوو ڕۆژێك نییە:

واتە ئەو کەسەی ژن دێنێ پێویستە بزانێ کێ دەکاتە هاوسەری خۆی چونکە بۆ رۆژێكو دوان نییە.

*** ژن ئاقری لەکۆشیە:**

ئەم پەندە هەموو ئافرەتێ ناگرێتەوە، بەلاّم هەندێکیان شاشو بۆشن زوو بەهەڵدادەچن.

*** ژن دەڵێن وەك هەناسەیە بۆ مێرد:**

واتە پیاو زۆر پێویستە، وەك چەقۆی نێو متبەق وایە.

*** ژنی بەکۆشی دراوا، نەچێتە ماڵی باوا:**

واتە ئافرەتی بەمێرد با هەبووەش بێت بچێتەوە ماڵی باوکی نرخی جارانی نامێنێ.

*** ژن بەتەنها کاروانە، دووان بێ عوریانە، ببنە سێ ئاخر زمانە.**

ئافرەت زۆر دەئاخڤن کەگردی بوون ئاگایان لێك نامێنێ.

*** ژن چییە؟ بەنەینۆكو کلدانەکی هەڵدەخەلەتێ:**

ئافرەت زوو بەهەڵە دەچن، چونکە دڵ سافو دڵ پاكو ناسکن.

*** ژنو تفەنگو ماین، لەکن کێ بێ هی وێن:**

ئەو سێیە مەرج نییە تا سەر لەگەڵت دابن.

*** ژن هەسانی مێردیە:**

واتە ژن هەیە مێرد لەخشتە دەباتو هەموو شتێکی پێ دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا قەلغانی پیاوەگەریاش بێ.

*** ژن بدە ژن مردیان، داینێ لەجێی حۆریان:**

واتە بێ ژنیان دیتیەو نرخی دەزانن.

*** ژن بدە ژن مردیان، کەر بدە کەر تۆپیان، یان دەڵێن (ژن بدە بەژن مردیان، مەڕ بدە مەڕ مردیان):**

واتە ئەوانە زۆر پێویستیان دەبێو ئەزموونێکی باشیان لەگەڵ بردۆتە سەر.

*** ژن زیز بێ، کوڕت کزەبێ، جوجکەت بەماڵێ وەردەبێ:**

واتــه‌ تــا ده‌تــوانی شــیرازه‌و قــه‌واره‌ی ماڵــت تێـك مــه‌ده‌، ئـه‌گینا ماڵـت تێكده‌چێ

*** ژنی به‌د ژانه‌، گه‌ر خۆتی لێ ده‌ی ماڵت وێرانه‌:**

واته‌ تا ده‌توانی خۆت له‌ئافره‌تی خراپ دوور بگره‌.

*** ژنی بینه‌ له‌بنه‌ماڵان، خوارزا ده‌چنه‌ سه‌ر خاڵان:**

واته‌ ژنی له‌بنه‌ماڵان بێنه‌ تا منداڵه‌كانت چـاك بـن، مـه‌رج نییـه‌ هـه‌مووش وابێ.

*** ژنی پیران، وه‌كی میران.**

چونكه‌ نرخی ژن ده‌زانن‌و كه‌م كه‌س به‌وان رازیه‌.

*** ژنی جوان دۆستی لۆ ده‌بی:**

واته‌ ئافره‌تی جوان ته‌نگ‌و چه‌ڵه‌مه‌ی بۆ په‌یدا ده‌بی.

*** ژنی دز حیزیشه‌.**

واته‌ ژن خراپه‌یه‌كی بچووك بكات هی گه‌وره‌ش ده‌كات.

*** ژن ژنی به‌سه‌رهات، شه‌رتی هه‌ڵات:**

واتا نرخی جارانی نامێنێ.

*** ژنی سه‌ربه‌خۆ میلله‌تێكی بێ حكومه‌ته‌:**

ئافره‌تی هه‌یتـه‌ی بێ لـێ پێچـانه‌وه‌، گـوێ بـه‌تان‌و پـۆی نـه‌ریتی كۆمـه‌ڵ نادات.

*** ژنی گه‌وران گرانه‌، حه‌وانه‌وه‌ی ئاسانه‌.**

ژنی په‌روه‌رده‌ باش گران‌و به‌نرخه‌ به‌ڕێوه‌بردنی سانایه‌.

*** ژن به‌بێ كه‌س هار ده‌بێت، پیاو به‌بێ كه‌س هه‌ژار ده‌بێت:**

واته‌ پێویسته‌ له‌گه‌ڵ یه‌كتر بن‌و چاودێری یه‌ك بكه‌ن.

*** ژن به‌زیز بوون سووك ده‌بێت:**

واتـه‌ ژن كه‌شـووی كـرد نابـێ زیـز بـێ، چـونكه‌ هـه‌ر ماڵـه‌ مێـردی خـۆی به‌كه‌ڵكی دێت.

*** ژن بینم یان نه‌ینم هه‌ر په‌شیمانم:**

ئەم پەندە لەکاتێ دەگوترێ کەپیاوێك دوو دڵ بێ لەژن هێنان.

*** ژن پرچی درێژە لەبیردا زۆر کورت و گێژە:**

مەرج نییە هەموو ژنێ وابێ.

***ژن سەگیش پێی ناومرێ.**

واتە پێویست ناکات دژایەتی ژن بکەی، قسەی پێ بڵێی.

*** ژن ستوونی ماڵە.**

واتە ماڵەکە بەئەوەوە رادەوەستێ.

*** ژن کراسی بەری پیاوە:**

واتە عەیب و عاری دادەپۆشێ و بۆ یەك باشن.

*** ژن و ماڵیان گوتووە:**

واتە دەبێ دەست رەنگین و بەخێو کەرێکی باش بێت.

*** ژن کەزیزبوو (تۆرا) گێسکی ماڵی پێی پێدەکەنێ:**

واتە نیبێ زیز بێ گەرنا خەڵك فشەی پێدەکەن.

*** ژن بێنە ژنانە، پێستە بکاتە هەمبانە:**

واتە گەر هەر ژن دینی با کابان و ماڵداری کەر بێ تا دەکرێ دەست رەنگین بێ.

*** ژنەك و عەشیرەتەك:**

واتە رەنگدانەوەی ئەو عەشیرەتەیە بەچاك و بەخراپ.

*** ژنی جوان دەردی بێ دەرمانن نەکوشتن نە تەلاق دان:**

واتە نابێ ژن لێی بدرێ یا تەلاقی بدەی.

*** ژنی خراپ منداڵی رەسەنی لێ ناکەوێتەوە:**

بۆیە پێویستە ژنی چاك بکەیتە هاوسەری خۆت، گەر ژن خراپ بوو ئەوە پەروەردەی منداڵەکانیشی باش ناکات.

*** ژنی چاك نیعمەتەن ژنی خراپ زیللەتە:**

ئەمەش باس لەچاکی و خۆشی ژن دەکات، خراپیش بەپێچەوانەوە.

*** ژنی کەچەڵ بەمووی کچی خاڵی دەنازێ:**

واتە هەندێ ژن هەن بەماڵە باوان دەنازن.

* ژنت زیزبی ریست لێ دەبێتە خوری:

واتە ماڵ تێك دەچێ، گەر ژنەکەی تێدا نما.

* ژن ژانە ژانیش سەرچاوەی ژیانە:

واتە هەر چۆنێ بێ دەبێ لەگەڵی ئیدارە بکەی، چونکە ژیان بەوانەوە بەندە.

* ژن داری شکەستییە.

— واتە: ناسکە دەبێ ئاگەداری بی

*ژن کەم دوویی، چەندی کار کەربی.

—واتە: ژن پێویست کەم قسە بکا، بۆ ئەوەی کارەکانی بەرێکی بکا.

* ژن گرێیە بەکەس ناکرێتەوە.

—واتەکەس بەتەواوی تێیناکا.

* ژن لە پاش سارەووەعدەکی مەتعی بکە، هەسپ لە پاش مانگەکی.

— واتە تاشارەزایی نەبی باسی بکە.

* ژن لەقەرجی ناکرێ.

—واتە مامەلەیان گرانە، ژنیان بەکەڵك نایێ.

* ژن لەکۆرێ بێتەوە، سەبەتەی نانی خۆی لەبەر ناگری.

— واتە: جوان دەبی

* ژن لەگەر مێردی خۆی یەك بی، با شەو نوستنی چارۆگی خۆی بی.

واتە: گەر دووهاوسەریەکتریان بوێ ژیانیان خۆش دەبێ.

* ژن لەگەر مێردی خۆی یەك بی، شەو دزەی بۆ دەکا.

— واتە دەگەنە پاڵ یەکتر.

* ژن مەکران بکا پیاو دەرەقەتی نایێ.

—واتە: ژن فێڵ بازن

* ژن دەوێ ژنانە، گۆشتی بخوا پێستی بکاتە هەمبانە، ژنم ناوێ ژنیژگە، گۆشتی بخوا پێستی بۆگەنی کا؟

— واتە: پێویستە کابان بێ.

* ژن و جوتیار بەخاترانە نابنە مار.

— واتە: تاسەر لەگەڵت نابن.

* ژنی باش بەکەس و کارت دەکا، ژنی خراپ لەکەس و کارت دەکا.

— واتە: ژنی باش خزمی مێردی دەوێ.

* ژنی بەوە سەر خەنجەران، مەی بەوە سەر کەسەران.

— واتە: قسەی رابردووی بەبیر مەهێنەوە.

* ژنی نایینی، خۆ لەماری خەرکی دەخزێنی.

— واتە: بەیەکێك دەگوترێ چاوی لەناموسی خەڵکی بێ ژنیش نەهێنی.

# (کورو کچ)... لە پەندی کوردیدا

کورو کچ ... ئەندامی سەرەکی خێزان پێك دێنن، کە لە ئەنجامی پرۆسەی هاوسەرگیری بەیەك گەیشتنی ژنو مێرد پەیدادەبن، بەڵێ کوڕو کچ درێژ پێدەری ژیانێکی ژیانن لەنێو هەر کۆمەڵگایەکیش بەجۆری لەم دوو رەگەزە جیاوازە دەروانن، هەیە کوڕی پێ باشترو پەسەندترە هەشە بە پێچەوانەوە بیردەکاتەوە.

ئێمە نامانەوەێ باسی سوودو زیانەکانی (کوڕو کچ) بکەین بەڵکو ئەوەی گەرەکمانە رۆشنایی بخەینە سەر دەربارەی ئەو پەندە کوردی بیانە کە "کوڕو کچ" ی تێدایە، بەهیوایین ئەم جیاوازیە لەنێو هیچ میللەتێك نەمێنێ بەتایبەتی میللەتی کوردی بەهیوایین بەیەك چاو سەیری رەگەزی نێرو مێ بکرێ سوودی گشتی هەبێت.

***کوڕەکەمان یا داربێت یا چاوی باوکی دەربێنێ**

واتە: گەر کور ئازابێ هچی لێ ی چاو نیە، ئەمە لەکاتێکدا دەگوترێ کە یەکێك واپیشان دەدات زۆر شت بکات، بەڵام ماوەی نیە ئەویش وای پێدەرێ.

***کوڕی کەس نابێ بەهی کەس.**

واتە: لەو کاتەدا گوتراوە، کە کەسانی هەبوو منداڵی دزراوییان بە خێو دەکردوو، یا منداڵی خەلکی تریان لابووە کەچی دوای بەجێ ی هێشتوون.

*کوڕ هەبێ، تاریکە شەو زۆرە

واتە: لەم کاتەدا دەگوترێ یەکێ مەنعی خۆی بکا، ئەوانیش ئەم پەندەی پێدەڵێن.

*کەس لە پرێك، نەبووە کوڕێك.

واتە: هەڵکەوتن‌و ئازایی و زانایی‌و گەورەبوون‌و خەبات‌و تێکۆشانی دەوێت.

*کوڕی باوکی خۆت بە، لە ڕێ ی شێری بڕۆ

واتە: گەر مێرشێ لەماڵی خۆی گەورەبێ ژنانی باوکی خۆی بخوات نۆکەری کەس نابێ دەتوانێ لەڕێ شێر بڕوات‌و کەس دەرەقەتی نایێ.

*کوڕت نەبێ لە کۆشێ نەبێ‌و نانیش لە کاسەی خۆ.

واتە: ئەگەر کوڕی لە کۆشی خۆی نەبێ، نانیش لەکاسەی خۆی نەبێ ئەوە پیاوە بۆ مردن باشەو ئەو منداڵەش نابێ بەمنداڵی ئەو چونکە پەروەردەی خەڵکی وەردەگرێ.

*کوڕی ئەو بابەیە

واتە: ڕێگەی بابی گرتیەو یەك مووی لانەداوە.

*کوڕی خۆم نانخۆری خەڵکی.

واتە: لە باوکی دوورکەوێتەوەو لە لای خەڵك دایە.

*کوڕی سەیەو گورگ دەخنکێنێ.

واتە: لە باوکی خراپترەو کاری نابەجێ دەکا.

*کوڕی ئەو پیاوەی نەمری کچەش عیلاجی خۆ دەکا.

واتە: کاری گرینگی بکرێ، هی ناگرینگ بە سانی پێك دێت.

*کوڕی خۆی سونەت دەکا، منەتی لەسەر خەڵکی دەکا.

واتە: ئیش بۆ خۆی دەکا، منەت لەسەر خەڵکی دەکا

*کیژی بەدایك، مەنجەڵی سەرپۆشە

واتە: دایك کەم‌و کوڕی کچی دادەپۆشی.

***کیژی داك پەسنێ، سەری دەچێتەوە سەر گاسنێ.**

واتە: کەسێك پەروەردەو رەگەز باشی بێت، کەلکی لێ دەبینێت.

***کیژی گەورە گندۆرەیە، ماوە دەرزێ**

واتە: کچ بمینێتەوە زوو تێکدەچێو بێ نرخ دەبێت، مەرج نیە هەموو کچێك وابێ.

***کوڕی دایکی، نەبوویتە هی بابی**

واتە: زیاتر لای دایکی بووەو گوێ رایەڵی ئەوە نەك بابی

***کوڕ ی لەوێ بابێ، وەفای لۆمن نابێ.**

واتە: کوڕی باوکی باش نەبووە، قەت چانابێو سوودی لۆئەونابێ.

***کوڕی حەمەدەمەلا دەزانی مار بکوژێ.**

واتە: بە یەکێکی شارەزاو چالاك دەگوترێ کە لە ئیشێك سەری لێ دەربچێ.

***کوڕی لە مەیدان سەرکەوتن دێنی، کیژ لەمارێ سێو دەنەخشێنێ، نامەرد بەینیان دەپسێنێ.**

واتە: کەسانی ناحەزبەینی دووعاشقان لێك دەکا.

***کوڕ مرکە، کیژ ناو مارك.**

واتە: کوڕ هەردەم دەمێنێ، کچە شوودەکا

***کوڕم بەمرە مرم، قیژەی کیژان دەبرم**

واتە: کوڕێکی تەواو بێ عەیبو عارو بەرچاوم.

***کوڕی خۆم لەدامەنێ خۆم.**

واتە: دەبێ نەوەکان بە بابیان بچن جا چ لە رووی پیشە یاخود لەرووی هەڵسوکەوتو ئەخلاقیان بێ دەبێ چاو لە باوکی خۆی بکا تاکوو لەدوا رۆژ شانازی پێ بکا.

***کوڕی مامان زۆرن، شەم بەرووان تەنکە.**

واتە: کوڕی خەڵکی زۆرن بەلام بەمن چی کە سوودی بۆمنو تۆ نەبێ کە لەکاتی پێویست دا یارمەتیمان نەدەن، جا با کوڕی خەڵکی هەرزۆربن

بەلاّم چی لیّ بکەین.

***کیژەکم بوو، هەوێیەکم بوو.**

واتە: هەندێ کچ هەیە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دایکیان زۆر خراپە وا هەست دەکەن لەگەڵ بچووکێك قسە دەکا یا مامەڵەیان خراپە یاخود کیژەش هەندێ جار کیّ برکیّ ی دایکی دەکا.

***کیژ بیە زوو گەورە دەبێ**

واتە: کیژ زوو پێدەگا کچ هەر لۆخۆی هەڵدەچیّو جاحێر دەبێ.

***کیژ تەشی دایکی دەرێسێ.**

واتە: دایك مەر تارێك بکا کچەی تەماشای دەکا تاوەکو رێچکەی ئەو بگریّ لەدوارۆژ سوودی لیّ وەرگرێت دایك چۆن بیّ ئەویش وا دەبێ.

***کچ تەشی دەرێسێت، کورکڤانی بابی دەژەنێت**

کچ کردەوەی دایکیو کوڕ هی باوکی فێردەبێت، بۆیە دەبیّ چاودێرییان بکریّ لە لایەن هەر دووکیان.

***کچ دەم لە قووچ**

واتە: زۆر گوتن لۆ کیژان ناشیرینە ،کارێکی ناشایستەیە.

***کچە تیمە بەتەنە، لەبەرخۆی دێت قووتنە، لیّ ی پەیدا بوو فتنە.**

واتە: بە کەسێك دەلێن دووربیّ، یاخود بەکەسێکی تر دەلێن پلە یەك بگورێتو خراپ بکا.

***کچە هەیتمی گەلالان، بۆینە کابانیّ مالاّن**

واتە: بەکەسێك دەگوتریّ کەشارەزایی لەهیچ شتێك نەبیّ یاخود بەیەکێك دەلێن شتێکی لیّ نەوەشێتەوە، وە جیّ ی خۆش بگرێت.

***کچی خۆت بە قوربانی کوری خەلکی مەکە.**

واتە: کوڕی خەڵکی بەتۆ چی کەهیچ سوودو خێری نەبیّو کیژی خۆت بۆ تۆیەو بەکەلکت دیّ، سوودی بۆت دەبیّ لەهەمان بەهەموو شێوەیەك بەرژەندی خۆتو نەکەیتە قوربانییان.

*کچی گوێدار، چاکترە لە کوڕی نازادار.

واتە: ئەگەر هەردەم کچ گوێڕایەڵترە من ناڵێم بەگشتی بەڵام تاڕادەیەك باشن لەگەڵمان یاخود گەر کچێك بەگوێت بکات ئەوا زۆر باشترە لە کوڕێکی جوان.

*کچی ئەو دایکەیە.

واتە: گەر دایکی خراپ بێ ئەویش خراپ دەبێ گەر دایکەکەش باش رێك و رێك بێ ئەوا کچەی وەکو ئەوە دەبێ یان هەروەکو ئەوە.

*کیژی تەرەچ و خاتوونیان نەگوتیە.

واتە: بەیەکێك دەڵێن کە نەزانێ کارێك بکات یان کارێکی لێ نەوەشێتەوە یان لێ ی نیێ و ئەوا تێك پێکی دەدات.

*کوڕت ساوانەبێ، دەغلت تەرمکار نەبێ

واتە: گەر منداڵی ساوابێ و بابە پیربێ و بمرێ،یان هەتیوو دەبێ، بێ چارە دەبێ، دەغلیش ئەگەر تەرە کارو لە ئاخیری پایزو زستانی بکرێ، واتە پاش پەرە ئەو دەغلە بەکەڵك نایێ.

*کیژ هەتا کچە مێردی دەوێ، کە مێردی کرد هەموو شتی دەوێ.

واتە: کچ گرینگ ئەوەیە شووبکات، پاش شووکردنی کۆمەڵە داواکاری زیاتر دەبێ تموحی زۆر دەبێ جا دەبێ ئەم داوایانەی بۆ جێ بەجێ بکرێ، ئەگینان هاوار بەماڵی دەبێ.

*کیژ دار گیزە هەرچی بەکنی دا تێپەرێ، پەلاری خۆی تێ دەگرێ.

واتە: هەموو کەسێك سەیری کچ دەکات کچیشیان بە نیوە کۆمەڵ داناوە هەموو کەس لێ دەپێچێتەوە حەز بە سەیرکردنی دەکات.

*کیژ ماڵی خەڵکینە، کوڕ گۆی زێرینە.

واتە: کچ لەماڵی باوکی وەکو میوان وایە هەردەبێ بڕواتە رێگاو شوێنی خۆی واتە کچ هەر دەڕوا بەڵام کوڕەکە ناڕوات و دەمێنێتەوە لەماڵی

باوكی گەر خێزانیشی پێك هێنا هەر ئەوا كوڕی ئەو ماڵەیە بەپێچەوانە كچەكە دەبێ.

***كیژ هەستاوە، بەیانی فەرشی هەرگرت لۆ نانی**

واتە: ئافرەتی كابان خانوومان لەكاتی خۆی ئێشەكانی خۆی رادەپەڕێنێ ناهێڵێ كاتیان بەسەر دا بڕوات و بۆدوای بێ نەخێر هەر لەهەمان كاتدا ئیش دەكا چ بەیانی بێ یان هەركاتێكی دیاری كراوبێ.

***كیژ مێردیان دەكرد، بێوەژنان سەمای دەكرد.**

واتە: كەسانێك هەن پەیوەندی بەوانەوە نیە كە چی خۆیان لەخەڵكی هەڵدەقولێنێت.

# ( بووكو زاوا )... له پەندی كوردیدا

بووكو زاوا.. بەو (نێرەو مێ)یە دەگوترێ كەپرۆسەی هاوسەرێتی تازە پێكدەهێنن.

لەكۆنەوە (بووك) لەڕۆژی بووكێنیدا تا رای (سپی سوور)یان لەسەردانا و بەجوانترین شێوە دەیانڕازاندەوە، ماڵی زاواش زەماوەندیان بۆ ساز دەكرد، كاكی زاواش خۆی لەپشتەو پەرداخ دەكرد، لەهەر قۆناغو سەردەمێكدا بەجۆی ئەم (مەراسیمە) بەڕێوە چووەو دەچێ، ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ئەم پەندانەی ووشەی (بوكو زاوای) تێدایە كەئەمانەن:

***بووك نیتی شیوی شەوێ، ئەنگوستیلەی دەستی دەوێ:**

—واتە: بەیەكێك دەڵێن، كەلەخۆی بەرزتر بڕوانی، پەلپێك بگرێ لەكارێكدا.

***بووكی پلكی، جێی لەجێی گۆلكی، یادەڵێن بووكی پوور، جێگای لەسەر تەندوور:**

—واتە: (پلك) كەبووە خەسوو، پلكایەتی نامێنێ، زیانیش دەبەخشێو خۆشەویستی نێوانیان نامێنێ.

***بووكەكەمان جوان بوو، بالووكەشی دەردا، یادەڵێن بوكەكەمان زۆر جوانە بالوكەشی لەلێوانە:**

—واتە: بەیەكێكی ناشرین دەوترێ، كەعەیبێكی تریشی لێپەیدابێ.

***بووكەكەی پەنا دیواریت، ڕۆژ هەموو ڕۆژ بەتاڵیت، بەشەو ناوماڵ دەماڵیت:**

—واتە: بەیەكێك دەوترێت لەناوەخات ئیش بكا.

***بووكێكمان هەیە ناشیی نەزان، تاوێ هۆڕ دەكا، تاوێ خویدان، یادەڵێن (بووكێكمان هەیە ناشیی نەزان، تاوێ توڕ دەكا، تاوێ هەمانە:**

—واتە: بەکەسێك دەگوترێ کاری نەشازو کرێت بکا.

***بووکێکمان هێنا بێ بارگەو بنە، کوتەك هەڵدەگرێ ئەلێ نۆرمە:**

—واتە: بەبووکێکی هارو هاج دەوترێ کەزەبرو زەنگی هەبێ.

***بووکی نزیك باوان، بەکەڵکی چیدێ:**

—واتە: هەمیشە دەچێتەوە ماڵی باوانی، بەکەڵکی چیدێ.

***بووك لەسەر زینی، یارزاق و یانسیب:**

—واتە: ئیش لۆی هەیە، لەکۆتایشدا هەڵ بوەشێتەوە.

***بووکی ساڵێ بەریدە ماڵێ، ئەگەر نەیکرد، بیهاوە چاڵێ:**

—واتە: بووك هێنان بۆ بارسووکی ماڵە، کەنەیکرد ئازاردانی ڕەوایە.

***بووکی لەگەڵ تۆمە خەسوو گوێت لێ بێ:**

—واتە: یەکێك دەیڵێ، کەقسە لەگەڵ یەکێك بکاو یەکێکی تری مەبەست بێ.

***بووکەکەی ماڵی مەتی، سەری سوورە پای پەتی:**

—واتە: بەبووك یان یەکێکی نەزان دەوترێ، کەجلو بەرگێکی ناڕێك دروست بکا.

***بووك بۆ دڵی زاوایە:**

—واتە: لەکاتێك دەگوترێ، کەبووك دێت هەریەکە قسەیەك دەکا، بەڵام یەکێك دەڵێ کورە بابە (بووك بۆ دڵی زاوایە) واتە ماجام ئەو بەدڵیتی ئێوە کەیفی خۆتانە.

***زاوا نیتی داندۆك، بووك دەیەوێ گۆیەرۆك:**

—واتە: پیاوەکە هەژارە، کەچی ژنەکەی داوای شتی زۆری لێدەکات.

***زاوا کەری، خەزوریتی:**

—واتە: گوێ ڕایەڵی ماڵی خەزووریتی، هاوکاری و یارمەتی دەریانە بەهەموو شێوەیەك.

# ( منداڵ )... له پەندی كوردی

منداڵ ئەوەبوونەوەرە پاكەیە كەخۆشی بەخاو خێزان دەهێنی، درێژە پێدەری ژیانە، فریشتەو ئاوە سكردنەوەی دڵەكانە گەلی پەندی كوردی لەسەر(مندل-مندار) هەیە، كەواتە لەكەلتوری كوردی گرینگی بەمنداڵ دراوە، پەندەكانیش ئەمانە:

* **منداڵ بەبابان هێتیم دەبی، بەدایكان سێوی دەبی:**

- واتە دایك گرینگترە بۆ پەروەردەكردنی منداڵ

* **منداڵی بێ باب، شەیتان دەییات بەرێوە:**

- واتە كەبەخێوكەرو پەروەردەكاریان نما تووشی زۆر كێشەوگرفت دەبن.

* **منالی وتی هوو: تێری نەخوارد لەگوو:**

- واتە: بەهەژارێك دەوترێ كەمناڵێ ووردی زۆربێو دەسكەوتی كەم بێ، بەهیچ جۆرێك پیانەگات

***منداڵ نەرێ بەسەری بابم، بانەش رێ بەگۆڕی بابم:**

- واتە گەر بەزیندوویتی سوودی نەبوو، كەخزمەت دایك و باوكی بكات، بابە مردووتیش هەرنەبێ وهیچ سوودی نییە.

* **منداڵ ریخەڕۆك كێشە:**

- واتە هەندێ جار منداڵی خراپ تووشی غەم و پەژارەی زۆرت دەكات.

* **منداڵێ سێزدە لەنێ، چەوانی نوسرایە:**

بەمنداڵێكی چەتوونو هار ها ج دەگوترێ.

* منداڵە هەولێری کەکیشکەی لەدەست بەربوو، دەڵێ خێری شێخەڵلایێ:

– واتە کەسانێك هەن کەشتێکیان لێ قەوما بەسەرخۆیان نامێنن، دەڵێت هەر خۆم دەموسیت وابکەم.

* مناڵ لەمناڵییەوە دیار:

– واتە نیشانەی زیرەکی یا تەمبەلی هەر لەتەمەنی مناڵییەوە دیارە، واتە لەسەرەتای قۆناغی ژیانیدا بەدیار دەکەوێ.

* منداڵی بەدەرمانان، ئاگاتەسەربانان:

– بەمنداڵێکی خۆشەویستی دایەو بابە دەگوترێ، کەچاویان لێیبیو هەمیشە دەرمانی بدەنێ تازوو گەورەبێو پێبگا.

* منداڵ نەژی، لەگووی رادیارە یادەڵێ، مناڵێ نەخۆش لەگوویڕا دیارە:

– واتە هەموو کارێکی خراپ نیشانەیەکی هەیە، یا هەمووشتی دیاردەیەگی هەیە.

* منداڵ گوجیلەیە، هەرچۆنی پەروەردەی بکەی وادەبێ:

– واتە منداڵ پەڕێکی سپییە، یاهەویرە چونت بوێت وادەردەچێ، کەواتە پەروەردەکردنی زۆر گرینگە.

* منداڵ ئانەگری شیری (مەمکی) نادەنێ):

– واتە هەشتێ تاداواو پێویست نەبوو نایتە ئەنجام.

* منداڵی خۆت بەقوربانی، منداڵێ خەڵ:ی مەکە:

– واتە: خزمو کەس، بەبێگانەمەدە، بەتایبەتی منداڵێ خۆت.

* منداڵی چاك، زینەتی دونیایە:

– واتە گەرمنداڵی باش بوو لەپاشەرۆژ سوودی بۆدایك باوكو كۆمەڵگاش دەبێ.

# ( خزم )... له پەندی كوردیدا

خزمو كەس و كارئەوانە دەگرێتەوە كەلەپشتو زگەوە لێت نزیك بن، لەزۆر ساتو ئاندا خزمو كەس بەكەڵكی مرۆ دێتو دەبنە قەلغان پشت بۆیو بەرگری لێ دەكەن، ئەوی ئێمە لێرەدا گەرەكمانە رۆشنایی بخەینە سەردەربارەی ئەم پەندە كوردیانەیە كەدەربارەی (خزم) هاتووە:

* **خزم پەرژینت نەشكێنێ، بەكەس ناشكێ:**

–واتە دەستنیشانی كارەسات لەخزمانەوە دێت.

* **خزم زۆری بەرئاگردان:**

– واتە بەكەسێك دەڵێن لەكاتی تەنگانەدا لەپشت نەمێنێتەوە.

* **خزم قیبلەیە قەت خوا نابێت:**

– خزمی باش رووگەیی كاتی تەنگانەیە.

* **خزم گۆشتیشت بخوا، ئێسكت دەشارێتەوە( ناشكێنێ ):**

– واتە خزم شتێكی تێدا دەهێڵێتەوە.

* **خزمت كێیە : هێشتا ژنم نەهێناوە:**

– خزماتی بەژن پەرە دەسێنێت

* **خزمی ژنان بەرە بەرە، خزمی پیاوان دەربەدەرە:**

– واتە پیاو كەژنی هێنا زیاتر گرنگی بەخزمی وان دەدات.

* **خزمی خەزور سەپانی شێخی، :**

بەكابرایەك دەگوترێ خزمی كابرایەكی بەناو بانگەیەكیتریش دەڵێ:

خزمی خەزووری سەپانی شێخی.

*** خزم خەزێنەیەو بەبێگانە مەیگۆڕەوە:**

– واتە هەر چۆنێ هەبێ خزمی پیاوی لەبیانی باشترە.

*** خزم زۆر بن، باگاو گەربن:**

– واتە ئەگەر خزمو کەس وکارت زۆر بێ، هەر باشە. جا هەر چ جۆرێك بن

*** خزمو کەس پەڕو باڕی پیاوییە:**

– واتە دەبنە شورایەکی پۆلاین بۆت، لە زۆر شت دەت پارێزنو عەیب و عارت دەرناخەن.

# ( بـــرا )... له پەندی كوردی

ئەوپەنـدە كوردییانـە كـەدەربارەی(بـرا) گـوتراون بەئومێـدین سـودیی هـەبێتو هەمیشـە نەتەوەكـەمان بـراو تـەبابن لەوانەیـە هەنـدێ لـەم پەندانەبەشێوەیەكی تر بێت، بەڵام هەرچۆنێك بێت ئێمە بەچاكو خراپ دەیخەینە روو:-

* برا حەز لەمردنی برا ناكات، بەڵام حەز بەنەبوونی نەكات.

– واتە:بۆحەز لـەمردن نەكردنەكـەی تـەواوە، بـەڵام بـۆ حـەز لەنـەبوونی كردنەكـــەی باوەڕناكـــەم هـــەمووبراەیك وابـــێ، مەگـــەر خـــراپو خۆپەرستەكانیان نەبێ.

* برا حەز ناكات برای لەخۆی پیاوتربێت بەڵام حەز نەكا كوڕی لەخۆی پیاوتر بێت.

–واتە مردن نەمانو لەناوچونە، بەڵام لەتـەماعو مـاڵی دونیـا حـەزدەكات خۆی لەپێش برای بێ.

* برا شەرنەكا ئەبلە باوەڕنەكا، یان دەڵێن: ( براو بـرا شـەڕ دەكـا، قەڵتـەبان، بـاوەڕ دەكا )

– (ئەبلە – نەزان) ئەمە تاردەیەك وایە چونكە هەمووكەس نرخـی دوایـی هەرئاشت دەبنەوە.

* برا گەورەی سولحان بە.

– كەبووی بەبراگەورە یانبەرپرسیاریەكت درایە دەست یاخودئەگەر كرای بـەدەم سـپی ودەمڕاسـتی كـۆرو كۆمـەڵێك ئـەبێ كـردەوەی چـاك وداد بەروەرانە بكەی بەدڵی هەموولایەك بێت.

* براو بەشیان وتووە، براوبەش.

– واتە برایەك یان هرەکەسوکاریَ: کەبەکەلکت نەهات چی لیّدیَ بالیّی بیَ.

* برابەبرادەر دان مەکە رۆژیَك لەرۆژان.

– واتە هەرچۆنیَ هەبیَ برا باشترە لەبرادەر، چونکە برادەر لەوانەیە پشتت لیَ بکاو لیّت دورکەویّتەوە، بەلاّم برا لەرۆژی تەنگانە دیّتە مەیدان..

* برا برایە، کیسەی جودایە.

– مەبەست ئەویەە ئەگەر دووسیَ برا لەباوك و دایکیَ: بن هاوبەشن لەماڵی باوکیان و ئەبیَ هەریەکە مافی خۆی بدریّتیَ هەر چەندە براشن بەلاّم کیسەیان جیایە، واتە برایەتی جیایە، سەوداو مامەڵەش جیایە.

* برا لە پشت برابیَ، مەگەر قەزا لەلای خودابیَ.

– ئەگەر یەکیّتی و تەبایی لەناو هەر کۆمەڵو حیزب ومیللەتیّك دابیَ سەرکەوتن مسۆگەرە مەگەر خوا قەزاو بەرا دروست بکات.

* برا گەورە بەو، گووی زیاد مەخۆ:

– واتە: بەیەکیّك دەوتریَ، کەبەئامۆژگاریی برایەکی گەورەی خۆی نەکا.

* برای دایك جیاوازە، وەك ماری بیَ ئینجازە:

–بەیەکیّك دەڵیّن کەخزمایەتیەکی دووری هەبیَ، قسەی ناشرین، یاکاریّکی خراپی دەربارەی کردبیَ.

*برایەتی بەزۆر ناگیریَ:

– بەیەکیّك دەڵیّن بەزۆر خۆی بکاتە برات

# ( میوان )... له‌ په‌ندی كوردیدا

له‌نێو هه‌موو نه‌ته‌وه‌و كۆمه‌ڵو كۆمه‌ڵگه‌یه‌ك، میوان‌و میوانداری هه‌بووه‌و هه‌یه‌ هه‌ریه‌كه‌یان به‌جۆرو شێوه‌و شێوازێك په‌یڕه‌وی ده‌كه‌ن، كوردیش له‌دێر زه‌مانه‌وه‌ سه‌ردان‌و میوان‌و میوانداریێتی تێدا بوبووه‌و زۆر ڕێزی میوانی گرتووه‌، ده‌بێ ئه‌و ڕاستیه‌ بڵێین كه‌میوان لای ئێمه‌ له‌سه‌رووی خانه‌ خۆی داده‌نیشێ‌و به‌تامترین‌و خۆشترین چێشتی بۆ لێده‌نرێ ڕایه‌خی نه‌رمی له‌بن ده‌بێ، لێفه‌ی گه‌رمی پێداده‌درێ، كه‌واته‌ ڕێزێكی باشی لێده‌ندرێ، ده‌بێ ئاماژه‌ به‌وه‌ش بكه‌ین كه‌جاران زێتر ڕێز له‌میوان ده‌گیرا نه‌ك ئێستا، به‌هه‌رحاڵ ئێمه‌ لێره‌دا گه‌ره‌كمانه‌ ڕۆشنایی بخه‌ینه‌ سه‌ر ئه‌و په‌نده‌ كوردییانه‌ی ده‌رباره‌ی میوان گوتراوه‌:

*** میوان خه‌ڵاتی خوایه‌.**

لێره‌دا بۆمان ده‌رده‌كه‌وێ كه‌خواش میوانی خۆش ده‌وێ وه‌كو دیارییێكیش پێشكه‌ش به‌و ماڵه‌ی ده‌كات كه‌په‌سه‌ندی ده‌كات، ده‌بێ باش بزانین دیاری‌و خه‌ڵات له‌هیچ كات‌و سه‌رده‌مێك ڕه‌تنه‌كراوه‌ته‌وه‌ به‌ڵكو په‌سند كراوه‌، به‌تایبه‌تی ئه‌گه‌ر له‌لای یه‌زدانه‌وه‌ بێ.

*** میوان خۆشه‌ویستی خوایه‌، خێروبه‌ره‌كه‌تی له‌گه‌ڵدایه‌:**

واته‌ نابێ له‌وه‌ بترسین كه‌میوان هات زه‌ڕو زیانی (ماد)یمان لێ ده‌دات، به‌ڵكو به‌پێچه‌وانه‌وه‌ میوان (خێروبه‌ره‌كه‌ت) ده‌خاته‌ ماڵه‌كه‌ته‌وه‌و ئاوه‌دانی ده‌كاته‌وه‌. كه‌واته‌ با ڕێز له‌میوان بگرین‌و پێی سه‌رگران نه‌بین، ماڵه‌كانمان پڕ بێت له‌میوان ئینجه‌ خۆشه‌.

*** كشه‌ كشه‌ مریشكه‌ ڕه‌شه‌، میوان جارێك‌و دووان خۆشه‌:-**

واته‌ پێویسته‌ میوان ڕه‌زای خۆی گران نه‌كا هه‌ر بێ‌و بچێ بڵێ (سلام‌و

علیك) هەر لەماڵی خەڵکدا نان بخواو نان نەداتە خەڵکی، بەمجۆرە میوان گوتراوە ئەو پەندەی سەرەوە. (میوان‌و ماسی لەسێ ڕۆژ زیاتر بمێننەوە، بۆگەنی دەبن ئەم پەندەش هاوشێوەی پەندی سەرەوەیە، واتە نابێ هێندە زۆر بمێنێتەوە کەخاوەن ماڵ لەئیش‌و کار بکات‌و گوێی نەداتێ‌و، لێی پاڵ داتەوە.

* میوان بەدیارییەوە جوانە:

هەڵبەتە دیاری خۆشەویستی بەتین تر دەکات لەنێوان دۆست‌و ناسیاواندا، گەر بێت‌و لەمیوانداری دابووی، واچاکە دیارییەکەش لەگەڵ خۆت ببەی بۆ خاوەن ماڵ، بۆ ئەوەی هەست بەبوونی خۆی بکات، لەپەندێکی تردا هاتووە (دیاری میوان سەلامە).

* میوانی جەژنی خانە خوێیە:

واتە گەر ماڵێك میوانی هات ئەوە دەبێتە جەژن لەو ماڵە، چێشت‌و خواردنی خۆش‌و باش دەخۆن بەهۆی میوانەکەوە.

* میوان لەمیوان دەگرێ سەراسوێ، خانەخوێ لەهەردووکیان.

وەك ئەوەیە میوان رکی لەمیوانەو خانەخوێ لەهەردووکیان، بەڵێ، پەندێکی تر گوتراوە (میوان کەیفی بەمیوان نایێ) مەرج نییە هەموو میوانێ وابێ، ئەم جۆرە میوانانە وا دەزانن میوانەکەی تر، بەشیان دەخوات.

* میوانی ناوەخت نانی لەسەرەخۆیتی:

واتە گە رکاتەکە گونجاو نەبێ‌و کاتی جەم‌و خواردن نەبێ، ئەوە خانەخوێ گەر (شیوو چێشتی) پێ ئامادەنەکرا ئاساییە، نابێ میوان وا تێبگات فەرامۆشکراوە، بۆیە ئەم پەندەی سەرەوە گوتراوە.

* میوانی رۆژەکی جاسووسی ساڵەکی:

لەم پەندەدا ئەوە بەدەردەکەوێ کەئەوەی میوانداری بێتە ماڵت، لەزۆر شت دەزانێ بۆیە دەبێ وریابی لەهەڵس‌و کەوت‌و ڕەفتار تا لەماڵ دەردەچی.

# ( دڵ )... لە پەندی كوردیدا

دل یەكێكە لەئەندامە سەرەكیەكانی لەشی مرۆڤ، بە پایتەختی ئەندامو جەستەی لەشی ئادەمیزاد ناسراوە،هەر كە ترپەكانی لێدانی دڵ وەستا ئەوە مرۆڤ دەمرێو گشت لەش و جەستەی لەجوولە دەكەوێ.

دڵ گەلێ پەند ووتە و شیعری بەسەر گوتراوەو نووسراوە، ئەوەی ئێمە زیاتر باسی دەكەین دەربارەی ئەوپەندە كوردیانەیە كەلەسەر (دڵ) وتراوە.

***دڵ پیر نابێ، چاو تێرنابێ:**

– واتە مرۆڤ لەسەر پشتی ئەم زەمینە گوزەربكات، ئەوە تەمەنیشی بەرەو هەڵكشان بچێ هەست بە پیری دڵی ناكات، هەمیشەیە چاوی رۆشنەو بەوی بێت هەموو دونیا هی ئەوبێتو لەبەردەستی دابێت.

*** دڵ سفرە نیە بۆ هەمووكەس بكرێتەوە:**

– مەبەست ئەویەیە رازی دڵت نابێ لای هەمووكەس بدركێنی ئەوەی لەدڵت دایە هەڵی رێژی.

*** دڵ مێشە لەسەرگووش دەنیشی و لەسەرگوڵیش دەنیشێ:**

– واتە ئەو پەندە بەزۆری لەوكاتەی كورێك كچێكی ناشرینی خۆش بووێو بەدڵی بێ دەگوترێ،واتە هەندێ جار شتە كەشیاویش نییە كەچی كەسەكە بەدڵیتی.

*** دڵی من سوڵتانە، كەتی ماڵێ وانە، چەند رەش و چەند جوانە:**

– واتە ئەمەش لەكاتێ دەگوتری كەئەو كەسە باش دەزانی بەرامبەركەی عەیبو عاری هەیە، یارەكەی (رەش)یشە كەچی دڵی هەر بۆی لێدراوە.

*** ئەو جێیە خۆشە كەدل لێی خۆشە:**

– واتە مەبەست لێرەدا ئەوەیە کەگرنگ فراوانی و جوانی شوێنەکە نییە، گرنگ ئەوەیە مرۆڤ لەشوێنی بێت بەدڵو سۆزی بێت.

* رەحمەت لەوکەسەی دوودلان یەك دەكا، لەعنەت لەو كەسەی دوودڵان لێك دەكا:

– واتەئەوکەسەی دووکەس بەیەك دەگێنیو ئاشتیان دەکاتەوە، ئەوە رحمەت و خێری بەردەکەوێ، بەپێچەوانەش بێت ئەوە تەوشی نەعلەتی خواو خەڵك دەبن.

* دڵی كەسلەخۆمەئێشێنە، كەئیشاندت بێ ئەندیش مەبە:

– واتە: مرۆ نابێ دڵی بەرامبەرەکەی ئازار بداتو بێ ئێشێنێ، کەشتی واشی روویدا دەبێ لەبیر نەکەینو بچین لەگەڵی ئاش بینەوە.

* دڵ لەگوڵ ناسكترە:

– واتە نابێ قسە وکردارێکی وابکەین دڵی خەڵك بریندار بکەین بۆیە ئەم پەندە گوتراوە، کە(دڵ لەگوڵ ناسکترە).

* دڵی ئاوی خواردەوە:

– واتە: ئەو پەندە لەوکاتە دەگوترێ کەکاروشتێ رووبدات بەدڵی بێتو پێی ئاسوودە بێت، کۆتایی بەکێشە و کارەکە بێت.

* دڵی خوێنی لێ دەتكێ:

– ئەو پەندە لەکاتی لیقەومانو دڵئێشانی کەسێك دەگوترێ کەکارەساتو کوژرانی نزیکترین کەس بەسەردابێ.

* دڵێ لەئاستیا بەردە:

– واتە: کەسانێك هەنە دل رەقنو قسەو ئامۆژگاری وەرناگرن، بەرامبەر کەسی بەرامبەرەکەی بێ دەنگە.

* دڵی هەزار رادەكات:

– واتە دوودڵە ولە دڵەراوکێ دەژی هەردەم ڕاڕایە.

* دڵی كەسی بەخۆوە نەهێشتووە:

– واتە زۆر کەسی تۆراندوەو بەکەسیش رازی نییە.

* دڵ لەدڵ مەدە: واتە دوو دڵ مەبە، لەهیچ ئیش وكارێ:.

# ( خین / خوێن )... له پهندی كوردیدا

جهستهی مرۆڤ پێكهاتوه له ئیسكوخوێن، بههۆی دهمارهكانهوه خوێن هاتوچۆدهكاتو دێتو دهچێ، لهنێو لهشماندا خوێن هێنهرو خوێنبهر رۆڵی خۆیان ههیه، هیچ گیانلهبهرێك نیه خوێنی نهبێ، چ زۆر چ كهم، گهر بێتو ههركهسێ خوێنی لهلهشدا نهمێنێ، ئهوه دهست بهجێ گیان لهدهست دهداتو دهمرێ، كهواته بۆ بهردهوامی ژیان ئهوا خین رۆڵێكی سهرهكیو كارێگهری ههیه بۆمانهوهمان لهسهر ئهم ئهرزهپانو بهرینه. ئهوهی من گهرهكمه ئهم جاره ئاماژهی پێبكهمو تیشكی بخهمه سهر دهربارهی ئهو پهنده كوردیانهیه كهووشهی ( خوێن)ی تێدایه، بههیوام سودی ههبێو كهس توشی نهخۆشی كهم خوێنیو پاڵهپهستۆی خوێنو هیچ نهخۆشیهكیتر نهبێ، پهنده كوردیهكانیش ئهمانهی خوارهوهن.

* خوێن بهر چاوی گرتیه.

– ئهم پهنده كوردیه لهكاتێكدا دهگوترێ، كهكابرایهك بیهوێت كێشهو چهرمهسهری بنێتهوه، ههردهم شهڕوشۆڕ بهردهرگای گرتبێو خۆی زۆرتوڕهبكاتو گڕبگرێو ساردنهبێتهوه.

* خوێن لهچاوی دهبارێ.

- ئهم پهندهش مانایهكهی بهپهندهكهی سهرهوه نزیكه، بهكابرایهكی دهسهڵات داری زۆردار دهوترێ، كهلهكاتی توڕهیی ئاگای لهخۆی نهمێنێو نهتوانێ خۆی كۆنترۆل بكاتو ههڕوگیف بكاتو بیهوێت شهڕو ئاژاوه بنێتهوه.

*** خوێن گرتوویەتی.**

– واتە دژمن دارەو بەهۆی خوێن ڕشتنەوە نێوانیان چاك نابێتەوە.

*** خوێنێك وابەناوچەوانیەوە ویە.**

– واتە لەڕەنگو ڕوخساری ڕادیارە کەدەیەوێت شەڕو ئاژاوەیەك بنێتەوە، خوێنەکەی نێوچەوانی بەڵگەیە بۆ هەبونی ئەم کێشەیە، دەیەوێت شەڕ بفرۆشێت.

*** خوێنی بخوات نۆخەی دانامرێتن.**

بەیەکێك دەڵێن کەزۆر لەکەسێك تورِبیێ، گەرهەرچی لێبکات نالێ ئۆخەی، یایەکێك حەقی لەسەر یەکێك بێت لەوکاتەدا ئەم پەندە دەگوترێ.

*** خوێن لەبەدەنی نمایە.**

– ئەم پەندە بەکابرایەك دەگوترێ، کەزۆر نەخۆشبێ، یا زۆر ترسابێ وای پێدەڵێن.

*** خوێنی کردە جامەك.**

– واتە تۆڵەی خۆی لێکردەوەو خوێنی لێگرتو زۆر بچوکی کردەوە.

*** خوێنی خۆت لەسەرە خۆت.**

– ئەم پەندە لەکاتێکدا دەگوترێ کەکەسێك خۆی بۆکارێکی مەترسیدار ئامادەبکات، دەست بۆ ئاگردرێژ بکات، خەریکی کارێك بێت ڕێی تێنەچێت.

*** خوێن نابێتە ئاو.**

– ئەم پەندەش لەکاتێك دەگوترێت کەخوێن لەبەینی دوو بنەماڵەو دووکەس بڕژێ، واتە لەمافی خۆی خۆش نابێ، بۆڵەی خۆی وەردەگرێتەوە، لەم کاتەدا ئەم پەندە دەڵێن.

*** خونچەی ئازادی، بەخوێن دەگەشێتەوە.**

– واتە هەرکەسو میللەتێکی ژێردەست بیەوێت ئازادو سەربەستو

سەربەخۆبێت، دەبێت خوێن بڕژێنیو ئازار بكێشی تابەمافەكانی بگات.

*** هەر پەنجەیەك خوێنی خۆی لێدێت.**

– واتە پەنجەكانی دەست وەكو یەكترنین، لەیەكتر جیان، ئەم پەندە لەكاتێ دەگوترێ واتە ئێشو ئازاری خەڵك جیایەو هەریەكەیان مافو داواكاری خۆی هەیەو دەبێت لەتۆڵە سەندنەوەش جیابن.

*** دەڵێ (خوێن)یان لێگرتیە.**

– بەیەكێكی لەڕوو لاوازو ڕەنگ زەرد دەگوترێ كەهێزو توانای نەمابێو كزو داماو بێت.

# (ســــەر)... لە پەندی کوردیدا

جەستەو لەشی مرۆڤ لەچەند پێکهاتەیەکی سەرەکی پێکدێت، سەریش یەکێکە لەئەندامە سەرەکیەکانی جەستەی ئادەمیزاد کەهەستی بۆنکردن و، بینین و بیستنی تیدا کۆبۆتەوە، سەرنەبێ ئەندامانی تر چ گرینگیەکی نامێنێ. من لێرەدا نامەوێ باسی هەموو سودو زیانەکانی (سەر)بکەم، ئەوەی گەرەکمە ڕۆشنایی بخەمەسەر دەربارەی ووشەی (سەر)ە لەپەندی کوردیدا، بەئومێدی هەموو ڕایەك سەر سەلامەت بن.

* **سەری نایەشێ پەڕۆیان لێدەبەستێ.**

- بەیەکێك دەڵێن، خۆی توشی کێشەو گیروگرفت بکات.

* **سەری لەبەر هەتاوێ سپی کردیە.**

- بەکەسێك دەڵێن سودی لەتاقیکردنەوەکانی ڕۆژگار وەرنەگرتبێت.

* **سەری گۆتە زمانی، هەتا نەتوم میوانی، خۆشیم نایەتە گیانی.**

- واتە زمانی لێناگەڕێ ئاسودەبێ وەك دەڵێن (زمان بەڵای سەرە).

* **سەری کەس نەچێتە سەر دوو بالیفان.**

- کەسێك کەتوشی کۆسپ و تەگەرە بو خۆشی نامێنێت.

* **سەری کەچەلان، دەکەوێتە باغەلان.**

- بەکەسێکی نەشیاو دەڵێن کەشێکی باشی بۆ هەڵکەتبێت.

* **سەرت فیدا کە، نەهێنیت ئاشکرامەکە.**

- واتە بەهیچ شێوەیەك نەهێنی خۆت ئاشکرامەکە.

* **سەری تێنێ کاو جۆ، هەتا مردن هەر بخۆ.**

– به‌كه‌سێك ده‌ڵێن هه‌ڵێكی بۆ هه‌ڵكه‌وتبیّ.

* سه‌ری بیّ ڕسق، له‌بن گری دا.

– هه‌ركه‌سیّ بژیت، ده‌رامه‌تیشی ده‌بێت، زۆر نا كه‌م.

* سه‌ری مه‌ڕی ، زگی گورگ.

– به‌یه‌كێك ده‌ڵێن خۆی باش نیشان بدات كه‌چی واش نه‌بێت.

* سه‌رت هه‌ڵبڕه‌، شیرت دمربڕه‌.

– واته‌ ده‌زانیو چۆن ده‌توانی به‌رگری له‌خۆت بكه‌.

* سه‌رمكی بێته‌ بڕین، به‌كه‌س نایه‌ته‌ كڕین.

– نرخ بۆ مێردان داناندرێتو كه‌لێنیان پڕنابێته‌وه‌.

* سه‌ر سه‌ردیان، هاوێشتیته‌ سه‌ریه‌ك.

– به‌دووكه‌سو لایه‌ن ده‌ڵێن پشتی یه‌كتر بگرن بۆ ئامانجێك.

* سه‌ر له‌بن به‌ردان بی، له‌بن منه‌تان نه‌بی.

– شه‌رمه‌زاری زۆر ناخۆشه‌.

* سه‌رباری له‌بن باری گرانتره‌.

– به‌كارێك ده‌وترێت له‌كۆتاییه‌كه‌ی زۆرگران بوه‌ستێت.

* سه‌رتوول و بن توول، تووله‌ی گه‌مبۆری، كوده‌له‌ی به‌جێهێشت پڕه‌ چه‌مچۆری.

به‌یه‌كێك ده‌ڵێن منداڵی به‌جیبێڵیّ بۆ خراپه‌كاری خۆی.

* سه‌ربه‌قوڕ سه‌ربه‌خۆ دمریّ نه‌وه‌ته‌مه‌.

– به‌كه‌سێكی بیّ ئه‌غبارو هه‌ش به‌سه‌ر ده‌گوتریّ.

* سه‌رت بچی، قسه‌ت نه‌چی.

– واته‌ پیاو ئه‌وپیاوه‌یه‌ له‌قسه‌ی خۆی په‌شیمان نه‌بێته‌وه‌و قسه‌ی خۆی نه‌دۆڕێنیّ.

* سه‌رخڕی، دۆبڕ.

– له‌كاتێك ده‌گوتریّ یه‌كێك سودی لێنه‌بیندریّ.

* سه‌رقۆزی بن ئاڵۆز.

– به‌كارێك ده‌گوتریّ له‌سه‌روه‌ جوان خۆنیشاندا له‌ناوه‌ڕۆك نه‌بی.

* سەرم ئاشە بنم تەپاشە.

– لەکاتێك دەگوترێ یەکێك ئیش و کاری زۆربێت.

* سەری بێ سەودا نایێلێتەوە:

– واتە بەدەست بەتاڵی ناگەرێتەوە.

* سەری بمری سیکەی نامری.

– واتە لەپاش خۆشی ناوی هەردەمێنی.

* سەری رەحمەتە بنی زەحمەتە.

– واتە سەرەتا بەخێرو خۆشیە، بەڵام کۆتایەکەی هیلاکیە.

* سەری لەبەردی ئەعەلعەد دا.

– واتە چیدەکا بابیکا، هیچ سودنابینی، زەرەرمەند دەبی.

* سەری هێران، بنی گەوران، یادەڵێن (سەری هێران، دایکی دێران).

– بەیەکێك دەوترێ، ئیشی خراپی لێ رووبداو خراپەکانی لەلای ئەوەوە دەست پێبکات.

* سەرمایە سەری ساحێبی دەخوات.

– واتە زەرەرو زیانێکی زۆری لێکەوتو مایەکەشی نەهاتەوەدەست.

* سەر دەداو سیر نادا.

– واتە سەری خۆی دەکا بەقوربانی نهێنی برادەرێك، بەراستی ئەمە بەرزترین رەوشتی مرۆڤە.

* سەر بۆ سەربرین، نەك بۆ سەرزەنشت.

– واتە مرۆڤ بمرێ باشترە، لەوەی کەلەنگیەك رووتێبکات.

* سەر بەسەر، بێ دەردی سەر.

– بەپیاوو ژنێك دەوترێ کەهاوتای یەك بن بەبێ زیادوکەم.

* سەرت نایەشێ بۆچ پەرۆی تێوە ئەپێچیت.

– واتە هەرچیت پێویست نەبوو بەکاری مەهێنە.

* سەرچۆپی بدەیتە دەست سەگ، بۆلای سەبەتەی نانی رائەکێشێ.

– بەگەورەیەکی تەماعکار دەوترێ، کەهەرچاوی لەقازانجی خۆیەوەبێ.

*** سەرچۆپی بدەیت بەگامێش، لای کادان نادا بەکەس.**

– هەمان مانای سەرەوەی هەیە.

*** سەر دروێن دڕی چاوێکن.**

– واتە هەردوو ڕوی یەکن، بەیەکێك دەوترێ کە دەرەوەو ناوەوەی وەك یەك وابێ.

*** سەر دەرگە ماڵ بسپارە.**

– واتە خۆت دەرکە، بامالّەکەت بڕوا، چونکە ماڵ دەبێتەوە.

*** سەرسوك وعەلاوەکەم.**

– واتە دەستکەوتن کەم بێو سەرم سوکبێ، باشترە لەوەی دەستکەوتت زۆربێ بەخەموخەفەتو دەردی سەریەوە.

*** سەرکزی دڵ وورییایە.**

– بەیەکێك دەوترێ، کەبەدیمەن گێلۆکەو لەدلا وورياو تێگەیشتووبێ.

*** سەرگەرمی بەبێگاریەوە، بەبێکاری باشترە.**

– واتە ئیش بکەی بۆ مەردوم، بابەبێگاریش بێ، چاکترە لەبێ ئیشی.

*** سەرهەڵبڕە، خوا بناسە.**

– بەیەکێك دەڵێن کەبیەوێ ستەمێك ئەنجام بدا.

*** سەری بەسوجدەوە ڕۆیوە.**

– بەتەوسەوە بەیەکێك دەوترێ، کەبەدرۆ خۆی بەپیاوێکی لەخواترس نیشان بدات.

*** سەری بوە بەناش، قنگی بوەبە ماش.**

– بەیەکێك دەوترێ کەسەری لێتێکچوبێ.

*** سەرێ بەدەستی خۆت نەیخورێنی، خۆرِوشتی ناشکێ.**

– چونکە کەس وەك خۆت شارەزای دەردی تۆنیە، واتە هەموو کەس دەبێ خۆی دەرمانی دەردی خۆی بکات.

*** سەری نەتاشێو ناوێنەشی نەداتە دەست.**

– بەیەکێك ئەوترێ، کەکتنێکی کردبێ بەیەکێكو جارِیش لێبدا.

* سەری دبڕێو ڕیشی بەشانە دەکا.

– بەیەکێك دەوترێ کەبەپەنهایی خراپەبکات لەگەڵ یەکێکا، کەچی بەدیمەنیش ڕێزی بگرێو قسەی خۆشی لەگەڵ بکا.

* سەری بێ دەلاك ئەتاشێ یادەڵێن (سەری بێ دەلاك مەتاشە).

– واتە بێ پرسو ڕا ئیش دەکا.

* سەری بێ سەودا ناوەستێ.

– بەیەکێك دەوترێ کەبەبێ ئیشو کاروهەوڵو تەقەلاّ دانەنیشێ.

*سەرێ بێ کلآو نیە لەدنیادا.

– واتە هەرکەسێك هاتە دنیاوە، خوا ڕۆژی خۆی بۆ دەنێرێ.

* سەری دونیا بە پوش نەگیراوە.

– بەیەکێك دەوترێ، کەکارێکی نابەجێبکات بەئاشکرا، واتە لەسەر هەموو شتێك پرسینەوە هەیە.

* سەری دوو بەرانان لەمە نجەڵێك ناکوڵێت.

– واتە دووپیاوی گەورە، لەیەك شوێنا هەڵناکەن.

* سەری شکاندوە، ڕیشیبەشانە دەکا.

– بەیەکێك دەوترێ، کەلەدوای دەست وەشاندن لەیەکێك، ئینجا دڵ نەوایی بکات..

* سەرێکی هەیەو هەزار سەودا.

– بەیەکێك دەوترێ،کە پڕ ئیش بێ.

* سەری کوێرە ماری لادەست دەکەوێ.

– واتە هەرچی لای مردوم دەست نەکەوێ، لای ئەو دەست دەکەوێ.

* سەری شکاوەو قنچیو ڕاوی بۆماوەتەوە.

– بەیەکێك دەوترێ، کەلەکارێکا تێشکاوبێ وەبەهەموو ڕەنگ زەرەری کردبێ.

* سەرێکی گا نەکرێ، بەقنگی کەرەوە.

– واتە تێکەڵو پێکەڵ، وەکەس لەکەس ناپرسێتەوە.

* سەری گرتۆتە خەنە، نەچیّ بۆراوە گەنە.

– بەژنیكی داوێن پیس دەوترێ، كەبەشوێن داوێن پیسیدا بسوڕێتەوە.

* سەرێك لەناو سەرانا نەبیّ بۆ برین باشە.

– واتە هەركەسیّ دووره پەرێزبیّ لەخزمەتكردنی گەلّو نیشتمانی، بۆنەمان باشە.

* سەری گرتوە كۆمە، لەخۆی گرتوە لۆمە.

– بەیەكێك دەوترێ، كەلەسەر كردەوەیەك لۆمەبكرێ، ئەوگوێ نەداتیّ، وەلەسەر كردەوەكەی خۆی هەربەردەوامبێت.

* سەری لەگویّ قەبر دەلەرزیّ.

– واتە زۆر پیرە كاتی مردنی هاتوە.

* سەری نایەوە.

– واتە بەداخەوە مرد.

* سەری لیّدەخوریّ.

– واتە ئارەزووی لەو شتەیە كەقسەی لیّدەكەن.

* سەربەقوڕین، دەهێنێتە پیكەنین.

– واتە گاڵتە چیەو قسە خۆشە.

* سەرسپی ناوسك ڕەش.

– بەیەكێك دەڵێن بەدیمەن خاوێنو جوانبیّ، لەناخیشەوە ڕقو قینەی لەدڵدابیّ.

* سەرو پێیە پیّ خۆش ناكریّ.

– واتە هیچ بەدەست نیە، دەستو پیّ سپیە.

* سەری كەچەڵ هەرلەتورەكەدابیّ باشترە.

– واتە هەرقسە یان كارێكی ناشیرنو زیانەبخش، هەرنەوترێو نەكرێ، باشترە.

* سەرێكە هێناومەو نایگێرمەوە.

– واتە واز لەو ئیشە ناهێنم، ئەگەر سەریشمی تێدا بچێت.

* سەرێکی هەیەو هەزار زمان.

واتە دوو زمانە.

* سەر هەڵبڕی، کڵاوت لەسەر دەکەوێ.

– واتە بەرزە.

* سەر قوزی بن ئاڵوز.

– واتەناوو ناوەڕۆکی یەکنیە.

* سەری هارو ماری تێدایە.

– بۆ شتێك دەگوترێ کەزۆر شتی سەیرو نەگونجاو لەگەڵ یەك پێکەوە لەجێگایەك هەبێ.

* سەرتاشین بێ تیف تیفە نابێ.

– واتە پیاو ئەگەر خۆی هاویشتە ناوکۆسپو تەگەران دەبێ خۆی لەبەر هەندێ ناخۆشی بگرێ.

* سەر زندی پاشەڵ مردی.

– بەکابرایەك دەوترێ لەقونەوە هەموو قسەیەکی دەکاتو بەلاّم بەکردەوەش هیچی لەدەست نایێو لەجێگای خۆی ناتوانێ بجوڵێتەوە.

* سەرئاو دمراوی زۆر دیوە.

– واتە دونیا دیتەیە.

* سەر بەقوربانی زگ.

– واتە تەماعکارە.

* سەر بێ ئەجەل ناچێتە ژێر گڵ.

– واتە هەموو گیانلەبەرێك دەمرێ.

* سەرچاوەی پیسە.

– بەکارێك دەورێ کەلەسەرەتاوە نەشیاوبێ.

* سەرو دڵی خۆش سکی برسی تێر ئەکات.

– واتە لەژیانێکی خەندە ئامێزیی خۆشگوزەران دەژی.

* سەری بچی نوێژی ناچی.

– واتە ئیماندارو لەخواترس‌و نوێژكەرە.

* سەری لەژێر بگری هەرئەو كوڕەیە.

– واتە هەر چاكەو پیاوەتیەكی لەگەڵ بكەی، منەتی پێنیە.

* سەری دەگاتە عەرشی فەلەك.

– واتە بالازو سەربەرزە.

* سەری سەی بەدیاری هێنایە.

– واتە شتەكە زەرەری زیاترە لەقازانج، دیاریەكەی بێ‌نرخە.

* سەری دوژمن بە پەمۆ ببڕە.

– واتە بەهەر شێوەیەك لەناوی ببە. یابەشێوەیەكی‌تر خەڵك ئەزیەت مەدە، تەنها دوژمنیش بێت.

* سەریشم چوو،ماڵیشم چوو.

– بەیەكێك دەوترێ كەخۆی‌و ماڵی لەسەر شتێ دانابێ.

* سەری هەزار هەزار پێكەوە دەبڕی.

– بەیەكێكی ستەمكارو زاڵم دەوترێ كەخوێنی خەڵك بڕێژێ.

# (چـــــاو)... لەپەندی کوردیدا

چاو راستگۆترین زمانەو مەزنترین سەرچاوەی دڵی مرۆڤەن هەرچاوە پڕیەتی لەرق‌و کینەو گوناهو توانج، یا پڕیەتی لەئەڤین‌و خۆشەویستی.
دەکرێ بڵێین.. چاو پەرتووکێکی کراوەیەو دەتوانین ناخی ناوەوەی خاوەنەکەی لەدوو توێیدا بخوێنینەوە، چاو ئەندامێکی سەرەکییەو بەهۆیەوە، رەش‌و سپی‌و تاریك‌و رووناکی لێك جیادەکەینەوە، هەموو شتێ بەهۆی چاوەوە دەبیندرێ‌و بەدی دەکرێ.
من لێرەدا نامەوێ سوودو زیانەکانی (چاو) بژمێرم ئەوەی گەرەکمە لێی بدوێم ئەو پەندە کرودییانەیە کەدەربارەی (چاو) گوتراوەو نوسراوە، بەئومێدم سوودی هەبێ‌و چاوەکانتان رۆشەن بکات.

- **چاوی برسی بەخۆڵ نەبێ چاوی تێر نابێ:**
— واتە تەماعکار بەمردن نەبی چاوی تێر نابێ.
- **چاو هەموو شتێك ئەبینێ تەنیا خۆی نابینێ:**
— مرۆڤ بەم شێوەیە عەیبی خەڵك دەبینێ تەنیا خۆی نابینێ.
- **چاو هەڵێنە، دونیا ببینە:-**
— واتە لەخەڵك سوود ببینە، ئەزموونیان لێ وەرگرە.
- **چاوی رەشم کاڵ بووە:-**
— واتە یەکێك کەزۆر چاوەڕوان بکات‌و چاوی هێڵ بێتەوە.
- **چاوی سۆر بوەتەوەو شتێکی لەچاوییە:-**
— بەیەکێك دەووترێ کەزۆر تورە بێ‌و چاوی سۆر ببێتەوە.

* چاوی حیز لەخۆیەوە پووت دەبێتەوە.

- ئەوەی کاری خراپی کردبـی لەچاوانی رادیارەو چاوی پـووت و مـات دەبنەوە.

* چاو بازەو بەکەس ناگیرێ:

- واتە: تەماشاکردن بەم لاو بەولا بە هـەموو کـەس نـاکرێ‌و ئـەم جۆرە تەماشاکردنانەش هیچ عەیبی تێدانییە،

چونکە بەدەستی خۆت نییە.

* چاوی دەران، خۆڵی سەران:

- واتە: ئەوەی بەتەمای خەڵکی بی هیچ بەهیچ ناکا

* چاو ئەگەر لووتیان لەبەین نەبوایە، یەکتریان دەخوارد ئەم دووباریە:

- واتە: دوو برا ئەگـەر گـەورەیان نـەبن گێروگرفـت لـەنێوانیـان دروسـت دەبێ،

* چاو لەرێی خەڵك خێل دەبێ:

- واتە ئەوەی چاوی لەدەستی خـەڵکی بـێ خـۆی تێـر نـاخوات‌و کـاری بەرێکی ناڕوات بەڕێوە.

* چاو بەچاوان دەکەوێ، ناهەق بەبن دەکەوێ:

- واتەمرۆڤ پێویستی بەیەکتر دەبێ‌و یـەکتر دەبیـنن، ئـەوەی ناهـەقیش بی ژێر دەکەوی.

* چاولەچاو شەرم ئەکا ، بەرتیلیش بەرد نەرم دەکا

- واتە : بێجگـە لـەوەی کەهـەر ئیشـکێت خـۆت بیکـەی باشـترە، بـەڵام دیاری‌و ئەرخە (واسیتە) یش دەرویان هەیە بۆ ئەوەی کەئیشەکەت زووتر بۆ بکرێ.

* چاوی پەڕییە تەوقی سەری:

- واتە زۆر رقی هەڵسا.

* چاوی هارومار دەردێنێ:

- واتە: ئازاو جەربەزەیە

*** چاو یەك‌و فرمێسك هەزار:**

– بەیەكێك ئەوترێ كەبەكوڵ بگرێ‌و فرمێسك هۆن هۆن بەچاوو رووومەتیا شۆربێتەوە.

*** چاو لەچاوی پیاو ژێر ماڵە نەكا:**

– واتــە: ( ژێرماڵــە) كرێچــی ئــەم رۆژەیــە چــونكە هەمیشــە ســەركزو چاولەبەری خاوەن خانووەو ناحەسێتەوە.

*** چاوێ لەدەریان، خۆی بەسەریان:**

– خۆر (خۆڵ) واتە ئەوپیاوو ژنانەی كە چاوبركێ ئەكەن‌و خــەریكی چــاو لەوەراندن لەگەڵ خەڵ:ی نامەرەمدا باكوێرای یان دابێ.

*** چاو ببیتە گیسكی هەباسی، نابینی بابی نەلیاسی:**

– بەكرانێك دەوترێـ بەهیچ جۆرێ جێبەجێ نەكرێت.

*** چاوت لەدەركەی بێ، قونت لە گۆركەی بێ:**

– واتە(گۆركە: ئاكردان): لەژووریش بیت ئاگاداری دەرەوەی ماڵێ خــۆت بە.

*** چاو تەلیێە تێزا بەگێزا دەكا:**

– بەكێك دەڵێن گەمە بەشتێك بكات كەلێ,ەشاوە نەبێت.

*** چاو وراو نیودی دەست هەڵێنانە:**

– واتە: نەرتسی‌و زانایی نیوەی سەكرەوتنە.

*** چاوی نییەو چاوو رووشی نییە:**

– بەیەكێك دەڵێ، كوێر بێ‌و ئاخاوتنەكانی دڵشكێن بن.

* چاو كۆشكی دۆشاوێ، مێشان دەگری بەداوێ.
* چاوی چاوێ دوو پشكی ، لەناوەندا ڕا بشكی.
* چاوم دەرچێ، ناوم دەرنەچێ.
* چاوی بەس هەرنایێ
* چاوی لەگەورەییە، برسێتی پشتی شكاندیە.
* چاو بەخۆڵ نەبێت پڕنابێتەوە.
* چاوت مەبڕە لەماڵی خەڵكی حەرامە قسمەتی خۆت بەسە بەنامە.
* چاوی بەفێل و حەسوود هەموو كەس دەبینی تەنیا خۆی نەبێ.
* چاوی بڕیە پشتی سەری
* چاوی بەرایی نادا
* چاوی حیزە
* چاوی شەمشەكۆرە هەناویان نەگوتیە
* چاوی گەش و جوان پێویستی بەكل نییە.
* چاوی لە پشتی سەری چوویتە دەرێ
* چاوی لەدەرێ ( خۆڵی تێوەری بەسەرێ ).
* چاوی لێ ناتروكێنێ؛
* چاوی مستەگ هەرزن دەگرێت.
* چاوێك تەنیا دۆستی ببینێ و ناحەز بەدی نەكا سوودی نییە.
* چاوێكی لەئاسمان ئەوی دیكەیان لەسەر زەوی بوو بۆیە ئاش بەتاڵێ بۆ مایەوە.
* بەچاو سەیرمكە بەدڵ روحم كە( ئەو چاوە كۆر بی دوژمنی خۆی ناناسی )

# (زمـــــان)... لە پەندی کوردیدا

یەزدانی بالادەست ئادەمیزادی بەجوانترین شێوەو شێواز دروستکردووە؛ ئەندامەکانی لەشیشی بەرێكو پێکی دابەشکردووە، هەر بەشێکیشی کارو فـەرمانێکی پێسـپێردراوە (زمـان)یـش یەکێکـە لەئەندامـە سـەرەکیو کاریگەریـەکانی مـرۆڤ، کەبـەهۆی زمانـەو لێـك نزیـك دەبینـەوەو لەیـەکتر تێدەگـەن، لەمێـژەش گـوتراوە ئـادەمیزاد چـەند زمـان بزانـی هێنـدە مرۆڤەیە.

هەڵبەتە دەبێ ئـەو راسـتیەش بـزانین کـە(زمـان)یـش مـافی خـۆی هەیـە ئەویش بەوە دەبێت کەئەو کەسە دووری بخاتەوەو لەقسەی خراپو بەوە رای بهێنــێ لەســەر قســەی بـاش، زمـان بەبەڵگـەو نیشـانەی مێشـك دادەنرێت، واتە کەسی ژیرو هۆشـیارو جوانی رەفتـاری بـەهۆی زمانـەوە دەردەخات.

نەتـەوەی کـوردیش یەکێکـە لەمیللەتـە زینـدووەکانی ناوچـەکەو زمـانی تایبـەتی خـۆی هەیـە، کەبـەجۆرەها شـێوەو شـێواز پـێ دەدوێ، بـەڵام بەداخـەوە تـا ئێسـتا زمـانێکی سـتاندەرمان نییـە، بەئومێـدین ئـەم خەونەشمان بێتەدی.

ئەوەی ئەم جارە دەمەوێت باسی بکەم دەربارەی ئەو پەندە کوردیانەیـە کەلەسەر (زمان) گوتراوە:

* **زمان بەرای سەرە:**

–واتە: واتە زمان گەر نەزانێ چۆن بەكاری دێنی، ئەوە دەبێتە بەرایەكی گەورەو تووشی چەرمەسەریو كێشەی لابەلا دەكات. زۆر كەسمان بینیوە بەهۆی زمانیانەوە تێچوونو لەناوچوون، یا تووشی هیلاكەتێكو چەرمەسەریەك بوون، كەواتە ئەم پەندە زۆر سوود بەخشە بۆ ئەوانەی تائێستا لەگرنگی زمان نەگەیشتوون هەر هاوشێوەی بەم پەندە پەندێكی تری بابو باپیرانمان هەیە كەدەڵێ:

* **گەر زمان بێڵێ سەر رەحەتە:**

– واتە وگەر زمانەكە بێ دەنگ بێتو خۆی لەقسان هەڵ نەقولێنێ ئەوە دەتوانی ببێتە هۆی حەسانەوەی مرۆڤەكە.

پەندی كوردی دەربارەی (قسەی خۆش)و (زمانی شیرین)یش فەرموویەتیان

* **بەقسەی خۆش مار لەكوون دێتەدەرێ:**

– واتە هەموو شتێ بەگفتوگۆی ئاشتیانەو رەفتاری باشو قسەی نەرمو نیانەی ئەوە كێشەكان چارەسەر دەبن، تەنانەت گەر دوژمنی یەكتریش بن، هەر سەبارەت بەقسەی خۆش گوتراوە .

* **قسەی خۆش لەبەهەشتەوە هاتووە:**

– واتە واتە ئەوەی دەیەوێت بەهەشتی مسۆگەر بكات با قسەی خۆش بێت، پەندێكی ترمان هەیە دەڵێ:

* **نانت جۆ بێ، خولقت گەنم بێ:**

– واتە: لێرەشدا مەبەستیان ئەوەیە كەیەكێكی گەر چووە ماڵێك با خاوەن ماڵ نانی خواردنەكەی (جۆ بێ) كەزۆر خراپە بۆ خواردن، بەڵام گەر (ڕوو و قسەی خۆش) بوو ئەوە هەموو شتێ دەهێنێ.

پەندێكی ترمان هەیە دەڵێت:

*** گەر قسەی باش نازانی قسەی خراپ هەر مەکە؛**

– واتە ئەم زمانە تەنها بۆ قسەو گفتاری باش‌و سوود بەخش هاتووە، نەك تۆ بەکار بێنی بۆ قسەی لابەلاو شەڕە جوێن‌و قسەی ناشایستەو دوور لەمرۆڤایەتی.

قسەیەکی تریش هەیە کەدەڵێت:

*( **گەر قسەکردن زیوو بێ قسە نەکردن زێڕە)، یا گوتراوە (بێ دەنگی جوانی مرۆڤە )**

– واتە هەردووکیان زۆر لەیەکتر نزیکن لەماناو مەبەستدان واتە کارو پڕۆژەکانی رۆژانەی مرۆڤ، هەموو ئەو پەندانە ئەوە دەگەیێنێ کەزمان رۆڵێکی سەرەکی هەیە لەپێشکەوتن‌و دواکەوتنی مرۆڤ، یا سەرکەوتن‌و ژێرکەوتنی مرۆڤ یا لەمانەوەو نەمانی مرۆڤ، کەواتە با زمانەکەمان راست‌و رەوان‌و پاراو بێ، تەنها بۆ قسەی باش بەکاری بێنین.

لێرەدا ئەم پەندو قسانەتان دەهێنینەوە یاد کەباب‌و باپیرانمان ووتویانە:

*** زمان بەرای سەرە.**

– واتە زمان مرۆڤ تووشی کێشەو چەرمەسەر دەکات.

*** گەر زمانی بیلێ سەر رەحەتە.**

– واتە ئەمەش مانای سەرەوەی هەیە.

# (قســــە)... لە پەندی كوردیدا

ئادەمیزاد لەوەتەی كەوتۆتە سەركۆشی ئەم دونیایە پانو بەرینەو زمانی پێوەلكاوە ئەوە توانی قسەو دەربڕینی هەبووەو هەیە، تاكە گیانلەبەریشە بەهۆی قسەو گفتارو ئاخافتنەوە لەیەكتری حاڵی دەبنو بیروڕا دەگۆڕنەوە، هەر نەتەوەو میللەتی بەزمانو جۆری ئاخافت دەكاتو دەدوێ، كوردیش وەك نەتەوەیەكی زیندووی ناوچەكە خودان دابو نەریتو زمانی تایبەتی خۆیەتی.
هەڵبەتە ئێستا لەسەرتاپای جیهان زیاتر لەدوو هەزار زمانی جیا جیا هەیە كەخەڵكان قسەی پێدەكەن، ئێمە لێرەدا نامانەوێ باسی سوودو زیانەكانی (زمانو قسەكردن) بكەین، بەڵكو ئەوەی گەرەكمانە لێی بدوێین دەربارەی قسەیە لەپەندی كوردیدا.
زۆربەی زۆری ئەم پەندە كوردیانە دەخەینە ڕوو كەچاكو خراپ باسیان لەقسە كردووە، بەئومێدین سوودی بۆ هەموو لایەك هەبێت.

*** قسە هەزارە، دووانی بەكارە/ یان دەڵێن (قسە بیستو چوارە، دوانی بەكارە):-**

– واتە: لەزۆر قسەكردندا چەند قسەیەكی بەسوودو بەكەلك دەكرێ، دەبێ مرۆڤ لەگوێی خۆی بگرێو بچێتە ناو مێشكیو بەكاری بهێنێ

*** قسەی زۆر هی پیاوی بێ دەسەلاتە:-**

– واتە: پیاوی دەسەلاتدار كاركردە، زۆر قسە ناكات، بڕوای بەكاركردن زیاترە، واتە زۆر گوتن باش نییە.

*** قسەی مەزنان، نەقشە لەبەردان:-**

– واتە: هەر پیاوێكی مەزنو گەورەو پڕ ئەزموونو بەسەرهات، زۆر شت دەزانێ وەك نەخش لەبەردیەو پێویستە گوێی لێبگرێو پەیڕەو بكرێ.

*** قسە لەتژی دێت:-**

– واتە: بەیەکێك دەڵێن کەقسەی زل بکاتو فیزی زلبێت، لەبەرزان نواڕیو ئاگای لەدەردی خەڵکی نەبێت.

*** قسەیەك کەلەسیو دوو ددانە چووە دەرەوە، سیو دوکەس پێی ئەزانن:-**

– واتە: ئەگەر ئەو سیو دوو کەسەش هەریەك بۆ یەکێکی تری بکرێنەوەو ئەوانیش دوای کەون ئەوا بڵاودەبێتەوەو هەموو کەس دەیزانێ.

*** قسە کەوتە زارێکی کەوتە شارێکی:-**

– واتە: دەبێ مرۆڤ زۆر بایەخ بەنهێنی خۆییو ئەو نهێنیانەی کەپەیوەندی بەبواری گشتی میلليو نیشتمانی هەیە بپارێزێ.

*** قسە گەوهەرە، عەقلیش جەوهەرە:-**

– واتە: قسە وەك دانەی گەوهەر وایە، نابێ بەفڕۆی دەیتو بەکەمی بزانی، وەهاژیریش جوانیو دیمەنێك بەئادەمیزاد دەبەخشێ.

*** قسەی خۆش لەبەهەشت هاتووە:-**

– واتە: قسەی خۆش پێوستو باشە، مەبەست ئەوەیە گەر هیچت پێنەکرا قسەی خۆش بکە لەگەڵ دەوروبەرت.

*** قسەیەك دەکەم بەمانا ئەگەر ژیریت (شێت نەبیت) بزانە:-**

– واتە: ئەوەی کەزاناو وریاو تێگەیشتوو دەبێت، بەنیشانەیەکی کەم، یان چاوهەڵتەکانێك تێدەگا، ئەو کەسەش کەنەزانو گێژو دەبەنگ بێت بەشەقیش تێناگات.

*** قسە بە پارە بوایە، هەندێ کەس دەوڵەمەند دەبوون:-**

– واتە: بەکەسی زۆر ڕەو زۆر بڵێ ئەو بەنوە.

*** قسەی پیاوان یەکەو نابێ بەدوو:-**

– واتە: مرۆڤی پیاوانە لەقسەی خۆی پەشیمان نابێتەوە، کەبەڵێنی دا سەلیشی لەسەر دانی پەشیمان نابێتەوە.

*** قسەی بەر ئاگردانیو نانی مام ڕەحمانی:-**

– واتە: گوتنی بەر ئاگردانو جێگای خۆشیو تێرو پڕی جیایە لەگەڵ ڕۆژی خۆشیو تەنگانەدا.

*** قسەی خەراپ نازانیو قسەی خەرا پیش دستەكانی ماچ دەكا:-**

- واتە: بەیەكێك دەڵێن كەقسەی باش نەكات، قسەی خەراپ زۆربكا.

*** ئەگەر قسەی خەراپ نازانی، قسەی خەراپ هەرمەكە:-**

– واتە: هەمیشە قسەی باش بكە، واز لەقسەی خەراپو بێ مانا بێنە.

*** قسەی باوكان بۆ كوڕان سەنەدە:-**

– واتە: یانی پێویستە منالّ بەقسەی باوكی بكاتو لەقسەی دەرنەچێ.

*** قسەی دڵی خۆت لەلای ژنی خۆت مەكە:-**

– واتە: هەندێ نهێنی هەیە پیاو دەبێ لەلای ژنی خۆی نەیڵێ، چونكە بڵاودەبێتەوە.

*** قسەی خۆت لۆ یار مەكە، یاریش یاری هەیە:-**

– واتە: قسەی خۆت بۆ كەس مەكە، هەر دۆستێك دۆستی هەیە.

*** قسەی بەر ئاگردانیو هۆنە هۆنی بەرازی زۆر لێك دوورە:-**

– واتە: قسە كاتی شینەیی‌و كاتی تەنگانە زۆر لێك دوورە.

*** قسەی دروست، كارسست:-**

– واتە: بەیەكێك دەڵێن لەقسان پاڵەوان بێو لەئیشیش هیچ.

*** قسەی وادەكات، بۆنی خوێنی لێدێ:-**

– واتە: بەیەكێك دەڵێن كەقسەكانی باش نەبێتو بیەوێت بەینی خەڵك تێكبدات.

*** قسەی شەوێ دەڕوا لەگەڵ خەوێ:-**

– واتە: هەندێ قسە هەیە بەشەو دەكرێ، لەگەڵ خەو دەڕوات، كەبوە بەیانی خاوەنی لەبیری نەماوە.

*** قسە یان لەشێتان یان لەمنداڵان:-**

– واتە: (شێتو منداڵ) هی ئەوەنین قسەیان لابكرێ، چونكە لایان گیرنابێ.

*** قسە بكوڵێنە، ئەوجا دەرپەڕێنە:-**

– واتە: دەبێ مرۆڤ قسەی خۆی هەموو بەحیسان بێ.

*** قسەی دوژمن هەزار جار بەرك ...:-**

– واتە: قسەی دوژمن حیسابی بۆ نییە.

*** قسە زیو بێت، بێدەنگی زێڕە:-**

– واتە: زۆر ڕاستە (بێدەنگی) لەزۆر کاتدا لەزێڕ باشترە، هەندێ کاتیش گوتن زێڕە.

*** قسە هەند بخودانە، هەندی بن ددانە:-**

– واتە: کەقسە لەدەی خاوەن دەرچوو هی خۆی نییە:–

*** قسە بەهەزار دیناری بێ، هەر دێتە سەر فلسەکی:-**

– واتە: قسە هەرچەندە بەنرخیش بێت هەر زوو بڵاودەبێتەوە.

*** قسە لەزاری دێتە دەرێ:-**

– واتە: قسەی خۆت بناسە چونکە لێپێچانەوە هەیە.

*** قسەی پیاوان لەسەنەد گەورەترە:-**

– واتە: پیاو دەڵێت بەڵێنی هەتا سەر بێت.

*** قسەی کورت و درێژ مەکە، ڕێگەی نزیك دوور مەکە:-**

– واتە: لەکورتی بیبڕەوە، پێکی بینە.

*** قسە لەسورەتی، خۆت گەورەتر مەکە:-**

– واتە: ئەگەر ناتووشی زیان دەبیت، چونکە بەری خۆت پێ لەئاوی ڕزگار ناکرێ.

*** قسە تانەی بێژی، نەیرێژی:-**

– واتە: قسە بیری لێبکەوە، ئینجا بیکە.

*** قسە فەقیرە هەموو کەس پێی دەوێری:-**

– واتە: قسە بەپارە نییەو هەموو کەس دەتوانێ بیکات، مەرج کردارە.

*** قسە قسە ڕادەکێشی:-**

– واتە: قسە لەدوای قسە دێت.

*** قسە لەدوای حەفت کێو نەگاتە بەخێو:-**

– واتە: کەواتە قسەو زەمی کەس مەکە، چونکە دوایی دەیگاتەوە پێی.

*** قسەی حەق ڕەقە:-**

– واتە: گەلێ جار قسەی ڕاست و دروست و حەق، بەرامبەرەکەت تووڕە دەکات.

* قسەی خۆش بەرد نەرم دەكا:-
- واتــە: قســەی شــیرینو خــۆش بەرامبەرەكــەت ڕازی دەكــا، كەواتــە باهــەر قسەمان خۆشبێ.
* قسەی وادەكا لەقوتوی عەتاردا نییە:-
- واتە: واتە ئەم قسەیە بێماناو كەس نەبیستووە.
* قسەی گەورە بەهەودنتە ناكرێ:-
- واتە: ئەگەر یەكێك لەخۆی ڕانەبینێ قسەی گەورە ناكات.
* قسە لەقافیەدا خۆشە:-
- واتە: قسە لەكاتو ساتی خۆیدا زیاتر مانا دەبەخشێ.
* قسە ناچێتە گیرفانەوە:-
- واتــە: قســە لــەدەم دەردێ، بــەگوێ گــوێی لێــدەگیرێ كەواتــە پێویســتی بەبیركردنەوەیە.
* قسەی خەراپ پۆستەچی زۆرە:-
- واتە: گەر قسەی خەراپ بكـەی خـەڵك بـۆ خـاوەنی دەگێڕنـەوە، بـەڵام هـی باش وانییە گەر مەتحی یەكێكت كرد.
* قسەی خۆت مەكە تەنها بۆ نەوەی گوێت لێرابگیرێ:-
- واتە: ئامۆژگاری كەسێك مەكە گەر بەگوێت نەكاو گوێت لێنەگرێ.
* قسەی شڕم بڕم مەكە:-
- واتە: قسەی بێماناو بێ سەروبەر مەكە.
* قسە نەكردن بەدەست خۆتە، بیدركێنی دەكەویە ناوی:-
- واتە: دەتوانی زیاتر بێدەنگ بی نەك قسە بكەی.
* قسە هەرچەندە بیجویت تفت دەبی:-
- واتە: زۆر لەسەر مەسەلەیەك نەڕۆیتو قسە دووبارە نەكەیتەوە.
* قسەی كۆدو لێبۆوە:-
- واتە: بەیەكێك دەڵێن كەقسەی پڕ بەپێستی خۆی نەبێ، هیچ مانا نەدات.
* قسەیەك بكە سەربگرێت، ڕبەیەك پڕكە جێ بگرێت:-
- واتە: قسەیەكی وابكە كەگوێت بۆ بگیرێو بەقسەت بكرێ.

# ( درۆ و درۆزن )... لە پەندی کوردیدا

درۆ.. دیاردەیەکی قێزەوەنە، پەتایەکی پیسی کۆمەڵ و کۆمەڵگایە، بەهۆی (درۆ)ەوە متمانەو راستی نامینێ، بردی نێوان کەسەکان درومی خۆشەویستیو تەبایی لەبار دەچێ، مرۆڤی درۆزنیش، هەمیشە روو رەشی لای خواو خەڵکە، من نانەوێت باسی زیانەکانی (درۆ) بکەم، ئەوەی گەرەکمە رۆشناییە بخەمە سەر دەربارەی ئەوپەندە کوردییانەیە کە ووشەی (درۆو درۆزنی) تێدایە، پەندەکانی ش ئەمانەن:

*** درۆ فەقیرە، یادەڵێ، درۆکەری فەقیرە:**

– واتە بێ پارە،هەمووکەس دەتوانێ بیکات.

*** درۆ ماوەی کورتە:**

–واتە زوو دەردەکەوێ وئاشکرادەبێ.

*** درۆ بەدلا ناچێ:**

– واتە هەرلەپێشەوە دیاردەکەوێ، ناچێتە دڵو دەروونەوە.

*** درۆ بێ دسەلاتە ،هەمووکەس پێدەوەستێ:**

– واتە سانایە وبەئاسانی دەکرێ،تەنها کەسی مەرد نایکات

*** درۆ دوژمنی خوایە:**

– واتە یەزدانی بالادەست زۆر رکی لەدرۆو درۆزن دەبێتەوە سزای بۆ داناون.

*** درۆزن هەرجارێك ئاشتا دەكا:**

– واتە هەرجارێك بڕوای پێدەکرێ.

*** درۆزن کەم خۆشە:**

– واتە هێندە درۆ دەکا، ئاگای لەخۆی نامینێ.

*** درۆزن شتی لەبیر نامینێ.**

– واتە لەخۆیەوە شت هەڵدەبەستێ، بۆیە خۆشی نازانی چی دەڵێ.

*** درۆزن ئاگر لەماڵێ بەربی،کەس بڕوای پێ،کا:**

– واته: متمانەی پێ ناکرێ، چونکه درۆی کردوه.

*** درۆ لەدوای مردن دەکرێ:**

– بەیەکێك دەڵێ، کەدرۆیەکی بەدەمتەوه کردبێ، هیچ نەترسێ لەوەی کەچاوی پێدەکەوێ، درۆیەکەی ئاشکرا بێ.

*** درۆ بێ دەسەڵاتی هەمووکەس پێدەوەستێ.**

– واته سانایه هەمووکەس دەتوانێ بیکات تەنها کەسی مەرد نایکات.

*** درۆزن ئاکامی ماڵ وێرانییه.**

– واته لەپاشەڕۆژ زیانی گەوره دەکا.

*** درۆزن چێشت دەخوا، نیوەڕۆ ناخوا.**

– واته گوریسی درۆکورته،دوای ئاشکرا دەبێو سوود نابینی.

*** درۆزن ڕووەشی دونیاو قیامەته:**

– واته لەهەردوو دونیا زیان دەکات و ڕووی ڕەشه.

*** درۆزن ئاگری لەماڵێ بەربی، کەس بڕوای پێناکا.**

– واته متمانەی لای خەڵك نامینی گەر ڕووداویشی لێ ڕووبدات.

*** درۆیەك بکە شایەد بەدیارەوەبێ**

– واته کەڕووداوێکی سەیرت دیت مەگێڕەوه تاشایەدت دەبێ.

# ( دەســـت ) ... لە پەندی کوردیدا

لەشی مرۆڤ لە چەند ئەندامێکی سەرەکی پێك دێت، بەهۆی ئەم ئەندامانەوە ئیش‌و کارەکانی خۆی رادەپەڕێنێ، پێداویستیەکانی خۆی مەیسەر دەکات، (دەست) یش یەکێکە لەو ئەندامانەی کە بە جەستەی ئەو ئادەمیزادەوە لکاوە، بەهۆی دەستەوە دەنووسین‌و دەخوێنین‌و شتەکان دەجولێنین، گەر دەستمان لەدەستدا، ئەوە زۆر کارو کردارمان پێ جێ بەجێ ناکرێ کەواتە دەست گرینگی خۆی هەیە. ئەوەی ئێمە گەرەکمانە لێرەدا رۆشنایی بخەینە سەر دەربارەی (دەست) لە پەندی کوردیدا، ئەم پەندانەی خوارەوە زۆربەی زۆر ئەو پەندانە لە خۆدەگرێ کە دەربارەی (دەست) گوتراوەونووسراوە:

***دەست نەنێیتە جۆ، تا گەنم پێ نەگا:**

واتە بە شتێکی کەم‌و ئاسانەوە خۆمان خەریك ئەکەین، تا ئیشێکی باشترمان بۆ دەست ئەدات.

***دەست بکەی بەهەزرا کونەمارا، لەیەکێکیانا مارێك هەر پێتەوە ئەدا:**

واتە ئەوەی زۆر بجولێ، جارێك هەر تووش ئەبێ.

***دەستە پاچەی کردم:**

واتە فریوی دام، یان خەڵەتاندمی‌و هەلێکی لە کیس دام.

***دەستی بزن، بنێ کاسە:**

واتە (ئاو بێنە) چونکە جاران(لەزۆلکاوەکاندا) ئاو ئەکرایە کوندەوە، کوندەش پیستەی بزنەو دەرگا کەشی لە دەستەکانیەتی.

*ده‌ستی دام به‌ كۆله‌ دره‌وشا:

واته‌ ده‌ستی بریم، یان ده‌سته‌ خرۆی كردم.

*ده‌ستی دوژمن هه‌ر بۆ ئه‌وه‌ باشه‌ كه‌ ماری پێ بگری.

تا پێوه‌ی بداو له‌ناوی به‌رێ، چونكه‌ دوژمن‌و مار هه‌ر دووژمنن، هه‌ر كامێكیان ئه‌ویتر له‌ناو ببات هه‌ر قازانجه‌.

*ده‌ستی ده‌ستی پێ ئه‌كا.

واته‌ ئه‌یخولێنێ.

*ده‌ستی زۆر ئامانی نییه‌.

واته‌ له‌ زۆردار پاڕانه‌وه‌ سودی نیه‌، یان كه‌ رۆیشت ئامانی زۆردارمه‌ده‌.

*ده‌ستی زۆر سامانی نیه‌.

واته‌ ئه‌وه‌ی زۆردار به‌ده‌ستی ده‌هێنێ، نابێته‌ سامان بۆی، چونكه‌ تۆڵه‌ی هه‌ر لێ ده‌كرێته‌وه‌ سامانه‌كه‌ی ده‌ست هه‌قدار ده‌كه‌وێته‌وه‌.

*ده‌ستی كه‌س بۆ ده‌می كه‌س ناچێ:

واته‌ هه‌ر كه‌سه‌ خۆی به‌كه‌ڵكی خۆی دێت، كه‌سی تر به‌كه‌ڵكی نایه‌ت.

*ده‌ستی نایه‌ كاسه‌:

واته‌ بووبه‌ مایه‌ی خێر بۆی.

*ده‌ستی گرت به‌ كه‌مه‌ی قنگیه‌وه‌

–واته‌ به‌ده‌ستی په‌تی گه‌ڕایه‌وه‌.

*ده‌ستی لات به‌گونی موفلیس

–به‌ قه‌رزارێك ئه‌وترێ كه‌ هیچی نه‌بێ، واته‌ خۆنایكوژی.

*ده‌ستمان ناگاته‌ چمكی كه‌واكه‌ت:

–له‌ رووی گله‌یی یه‌وه‌ به‌كاردێت، واته‌ گه‌وره‌بوویت، یان خۆت به‌گه‌وره‌ ئه‌زانی.

*ده‌سته‌ك ئارۆز، ده‌سته‌ك پیرۆز.

–هه‌ندێك كه‌س به‌كه‌ڵك‌و هه‌ندێكی تر بێ كه‌ڵك.

***دەستە خوشكی بەدەستەبرای، دەستەبرای بە دەستەخوشكی، كۆنە باستۆكێ:**

–برادەرایەتی (كچ)و (كوڕ) لەدوای دا، ئەنجامی بەیەك گەیشتنە.

***دەستت هەتابە هەنگینە دەیمژێ، كە نەما دەیگەزێ:**

–واتە كەڵكت هەبێت خۆشەویستیو رێزت لێدەگرن، ئەگەر نابە پێچەوانەوەیە.

***دەستی ئەستووری، دەستی زراوی بردیە:**

–زۆردار بێ هێز لوول دەدات.

***دەستی لە هەموو پنچێكا برایە.**

–بۆ یەكێك بەكاردێت هیچی لەدەست لەمابێتو چی پێنەكریت.

***دەست لە چۆك ومرینان هی پیاوان نیە لەكاتی لێ قەومان:**

–واتە پیاوی پیاوانە لە رۆژی تەنگانە دەست هەڵدێنێ.

***دەستی خۆتو مستی خۆت:**

–واتە ئەگەر دەستی خۆت كارنەكات هیچت پێ ناكرێ.

***دەستی چەپت حەوجەی دەستی راست نەبێ:**

–واتە پیاو حەوجەی كەسو كاری خۆشی نەبێ.

***دەستی كەریمی كەس ناگێڕێتەوە.**

–لەكاتێك دەگوترێ كەیەكێك پێوی شتێك بداتە یەكێكی تر.

***دەست خێران دەخرێتە چاوان:**

–واتە هەر كەسێك خێرو چاكە بكات، خەڵك خۆشیان دەوێ.

***دەست ئەگەر شكا دەبێ هەڵبەتێ:**

–واتە بەرایەك هات دەبێ شوكربێ

***دەست دەستی دەناسێ:**

–ئەمە زیاتر بۆ قەرزو ئەم جۆرە شتانە بەكاردێت واتە ئەبێ دەست بە دەست بدرێتەوە خاوەنی:

***دەستێك كە شكا وەكی خۆی لێ نایەتەوە:**

–هەر شتێكی كە لەجێ ی خۆی لاكەت وەكی خۆی لێ نایەتەوە.

***دەستێكم كەوتە پێش، دەستێكم كەوتە پاش.**

–بە كابرایەك دەڵێن دوو دڵ بێ لە ئیشو كاردا، ئەوەش باش نیە.

***دەستی كورتی منو دامەنی درێژی تۆ:**

–ئەمە زیاتر بۆ پاڕانەوەیە، لەكاتێك یەكێك بێ چارە لە پیاوێكی دەستەڵاتدار بپارێتەوە ئەمە دەڵێ.

***دەستی زێر دەبڕێ.**

–بە ئافرەتێك دەگوترێ كە نەخشو تەوەنو وردەكاری زۆر بزانێت واتە سوود مەندبێت.

***دەستی ماندوو، لەسەر زگی تێرە:**

–واتە دەست كاربكات، هەردەم زگی تێرە

***دەست لێ مەدە چە پە بقەیە:**

–بە یەكێك دەڵێن وەكی منداڵ ناز بكات.

***دەستێكی زاڵم ببڕی خوێن نیە:**

–چونكە تەرازوو بەلای ئەودا دەلنگیو كەس نیە بتوانێ هەقی لێ وەرگرێ.

***دەستی بتەنێ نەچتە سەر خواردنێ**

–واتە بە تەنیا بۆ هیچ ئیشو كارمەچوون هەتا بۆ سەر خواردنیش.

***دەستی بە كلاوی خۆی گرتووە یا نەییات.**

–یەكێك ئەمە دەڵێ كە لە كارێك نائومێد بووبێ.

***دەستی خۆی دیت باوكی خۆی ناناسێ:**

–بەیەكێكی سپلەو لەخۆبایی دەگوترێ.

***دەست لەدەست قوەت لەخوا:**

–واتە ئەگەر یەكێتی و برایەتی هەبێ قوەتیش لەخودا دەبێ

# ( دەرمان و نەخۆشی ). .. لە پەندی كوردی

لەوەتەی مرۆڤ جەستەو روخساری بۆ دروستكراوەو بە پەیژەكانی ژیان سەركەوتووە لە قۆناغەكانی تەمەنیدا تووشی نەخۆشی و دەردو بڵاو چەرمەسەری و كێشەو گرفت دەبێ، ئەوستانەی ئادامیزاد نەخۆشی دەكەوێت، زیاتر بیر لەلەشی خۆی دەكاتەوەو هەست بەماندووبوون و ئێش و ئازار دەكات، بۆیە هەمووماڵی دونیا بۆ لە حزەیەك خۆشی و تەندورستیەكی باشی خۆی هەڵبژێری.

پەندی كوردی ئەو لایەنەشی فەرامۆش نەكردووە، كە پەیوەستەبەنەخۆشی و داوودەرمانەكان، بۆیە بۆ وەبیرهێنانەوەی ئێوە چەند پەندێكیتان دەخەینە بەرچاو بە ئومێدی سوود بینین و دووربونتان لەگشت نەخۆشی و ناخۆشیەكی ئەم ژیانە نالەبارە پەندەكانیش ئەمانەن:

* پێشی تاین، بەرە بەخۆت دادە:

– واتە: پێش ئەوەی ئێش و كارێكت بێتە پێش خۆت بۆی ئامادەبكە.

* منداڵی بەداو دەرمانان، ئاگاتە سەریانان:

– واتە منداڵێك هەر بەداو دەرمان گەورەبێ، ئەوە زۆر نازی و ناتوانێ خۆی پێبگینی.

* كۆرە هەتا دەمری هەر بەتەمای دووچاوی ساغە:

– واتە ئەوەی نەقوستانیەكی هەبێ ، هەر چاوەڕوانە، مرۆڤیش تابژی بەهیواو ئومێدەوە دەژی.

* مەیموون بەخۆی نەبوو سۆریكەشی لێ هاتووە:

– واتەكارێك بەخۆی نەبێ، كەچی نالەباریشی بێتە سەروتووشی

كیروگرفتێك بێت.

*** ئەگەر كەچەر (( تەبیب )) بایە تیماری سەری خۆی دەكرد:**

– واتە گەر مرۆڤ ئیشێكی پێ بكرێ ئەوە یەكەمجار سوود بەخۆی دەگەیەنێ ئینجا بۆ كەسانی تر، بەو كەسانەش دەگوترێ كەخۆیان دەسەلاتی چارەسەركردنی كێشەی خۆیان نەبێ كەچی رێش بۆ خەڵك دابنێن.

* سەرت نایشی پەڕۆی تێمە ئاڵێنە:

– واتە كارو كێشەیەك پەیوەندی بەتۆ نەبوو خۆتی تێمە ئاڵێنە.

*** ئەگەر خوانە نێری شیفا، تەبیب هیچی پێ ناكرێ بەتەنیا.**

– واتە گەر یەزدان مەیلی لەسەر نەبێ نەخۆشی چارەسەر بكات، بێ سوودە.

*** خوادەردی دایەو دەرمانیشی دایە:**

–واتە: مرۆڤ بەدەردو نەخۆشی لەڕولاواز دەبێ،هەر چەندە دەرمانیشی درایە.

*** دەرد خەلاتی خوایە:**

– واتە هەندێ جارخوا خۆشەویستی خۆی بەسەر دەكاتەوەو نەخۆشی ودەردوبەلای بەسەر دێنێو تاقیدەكاتەوە.

*** سیو دوو دەردی لێیە:**

–واتەبەیەكێك دەڵێن كەدەردو بەڵای زۆر لەسەر كەڵەكە بێ.

*** بەشەو دەگرێ تا، بەرۆژ بەرت دەدا ماخۆ چاوچاو چ دەرمان دەدا:**

–واتە لەدەسەڵاتی خۆت داینە،هەموكەس حەزدەكات لەش ساغ بێت.

*** رەنگ زەردی وەك مردیان چارە ناكرێ بەنووشتیان.**

– واتە خراپ نەخۆش كەوتیە، چارەسەری گرانە

# (شـــەڕ)... لە پەندی کوردیدا

شەڕ هەمیشە بەرۆکی مرۆڤـی گرتـووە، واتـە ئـەم ژیانـە نالـەبارە بریتـی لەکێشەو چەرمەسـەریو شـەڕو ئاشووبوناسۆرە، شـەڕ دژی ئاشـتیيەو مایەی زەرەروزیانە، بەهۆی شەرەوە کێشەکان قـوڵترو زامـەکان بەسـۆتر دەبن، شەڕ کوشتو کوشتارو لەناوچوونو کاوڵکاری لەگـەڵخۆی دێنێـت، مایەی بێزاریو پەسـتیو ناخۆشـییە.مـن لێـرەدا نامـەوێ باسـی هـەموو زیانەکانی شەڕوشۆڕ بکەم ئەوە گەرەکمە ئەمجارە ڕۆشـنایی بخەمەسـەر دەربارەی ووشەی((شەڕ))ە لەپەندی کوردیدا، بەئومێـدم شـەڕ دووربێـت لەهەمووکەسو ناوچەیەك پەندەکانیش ئەمانەن:.

* شەڕ بەچەكو مامەڵ بە پارە.

– واتە هەر شتێ بەشتی خۆی بەکاردێت، چەکیش بۆ شەرەو پارەش بۆ مامەڵەیە.

*شەڕ بەکەونە، دەکرێ:

– واتە ئەوانەی ڕقو کینەیان لەدڵە، هەمیشە هەوڵ دەدەن شەڕو ئاژاوە بنێنەوە لەشەڕ بێزار نابن.

* شەڕ دوایی بەشەڕ نادات.

– واتە شەڕ هیچ سوودی نییەو هیچ شتێ بەشەڕ کۆتایی نایەت، کۆتایی هەر پەشیمانییە.

* شەڕ قەلای مەردانە(شەو قەلای مەردانە).

– واتـە شـەڕو شـەو کەسـی مـەردوو جـوامێری دەوێـت، خـۆی لەبـەر ناخۆشییەکانی بگرێت.

* شەڕ لەبەتاڵی باشترە.

– واتە پیاو نابێ بێ ئیش‌و كار لێدابنیشێ، دەبێ ئیش‌و كاربكات بەهەر شێوەیەك بێت.

* شەڕ لەبادینان تۆز لەبەر دەركەی مەیە.

– ئەم پەندە كوردی‌یە لەكاتێكدا دەگوترێت كە شەڕو ئاژاوەیە هیچ پەیوەندی بەوكەسە نەبێ‌و تێدا گلابێ، واتە ئەم شوێن‌و كەسە لەم مەسەلەیە دوورە.

* شەڕ لەشۆ، نەك لەتۆ.

– واتە هەموو شتێ لەسەرەتادا ڕوون بكرێتەوەو بەدیار بخرێ، نەك لەدواییدا كێشەو گرفتی لێبكەوێتەوە.

* شەڕكەر، ئاشتیت لەبیر بێ.

– واتە گەر شەڕیشت كرد بایی ئەوەندەی تێدا بێڵەوە كەدوایی ئاشت بیتەوە.

* شەڕی خۆترێن مەكە زەرەتە.

– واتە گەر زانیت لەكاروو كردەوەو شەڕێك سەركەوتوونابیت مەیكەو خۆشت بەهیلاك مەبە.

* شەڕو تڕ بەدەست پیاو نی‌یە.

– واتە ئەم دوانە بەدەست خۆت نی‌یە، گەلێ جار یەقەی پیاو دەگرێ.

* شەڕ دوایی دێت قسە دوایی نایێ.

– واتە پاش هەموو شەڕێ بۆڵەبۆڵو قسەو قسەلۆك هەر دەمێنێ.

* شەڕی هێستروو بارگینان، كەروگا تێدەچن.

– واتە شەڕی نێوان بەهێزەكان بێ هێزو هەژارەكان تێدەچن‌و دەبنە سووتەمەنی.

* شەڕ مەكە بێ دەعواش دامەنیشە.

– واتە كێشەو شەڕ مەنێوە، بەڵام لەمافی خۆشت خۆش مەبە.

* شەڕ بوویە شەڕ ناوبژێکەر، سەری دەشکێ.
— واتە شەڕ کەرەکان بۆ یەك دێن ئەو بەردەکەوێ.
* شەڕ لەشەڕگە خۆشە.
— واتە هەمووشتێ ، گەر شەریش بێ لەکاتو شوێنی گونجاوی خۆی باشە.
* شەڕی دایكو کیژان، ڕۆژی پایزان.
واتە شەڕە ماوەیەکی کەم دەخایەنێ لەنێوان ئەم دووانە، وەك ڕۆژی پایزان کورتە.
* شەڕ چووە، خێری مایە.
— بەکارێك دەگوترێت ناخۆشیو نەهامەتییەکانی بەکۆتا هاتبێو بەرو خێرو چاکە هەنگاو بنێت.
* شەڕە دار خوار زار خا، شەڕە شیروتیر، نەتەوەی بابو باپیر.
— واتە شەڕی نیوان خزمو یەك نەتەوە ئاساییە بەکۆتادێت، بەلام شەڕی نێوان نەتەوەکان بەسانایی بەکۆتانایەت.
*شەڕێك کلکی کەری کولی تیا دەبڕێ.
— ئەم پەندە لەشەڕی چەند مرۆڤێکی نەزانو نەشارەزا دەگوترێت، کەهیچ سوودی نەبێو کەس لەیەکتر حالی بەبێ.
لەدوماهیدا هێڤی خوازین شەڕوشۆڕ لەولاتەکەمان دوور بکەوێتەوەو بەئازادیو ئاشتی بژین.

# (ئیش و كار)... لە پەندی كوردیدا

لەوتەی ئادەمیزاد كەوتۆتە كۆشی ئەم جیهانەو خول دەخوات لەسەر ئەم زەمینە پانو پۆڕەدا، ئەوە هەردەم هەوڵی داوە ئیشو كاربكات بۆ ئەوەی بژێوی ژیانی پەیدا بكات.

كار كردن دەروازەیەكی سەرەكییە بۆ دابین كردنی پێویستیەكانی ژیان لەهەموو رووێكەوە، دەبێ ئەوەش بزانین لەهەموو كاتو سەردەمێكدا جۆرو شێوویەی كاركردن وەكو یەك نەبووەو نابێ، بەڵكو لەگەل گۆڕانكاریەكانی سەردەم ئەویش گۆڕانكاری بەخۆوە بینیوە قۆناغ بەقۆناغ پێشكەووترە بووە.

كاركردن: دلو دەروونی مرۆڤ ئاسوودەو فراوان دەكات، هەر چەندە بەجەستە ماندوو دەبێ، مێشكی هیلاكو جەنجاڵ دەبێ، بەڵام پاشان خۆشیەك ئاوێتەی ناخی دەبێ، كەبە خۆشی نازانێ چییەو چۆنە، ئەم مرۆڤانەی كارناكەن هەمیشە بەزەخەلو زەنتە و تەمبەڵو هیچ ناسراونو بەرچاو و دڵی خەڵكی ناكەون.

من نامەوێت هەموسوودو مەرامەكانی كاركردن شی بكەمەوە ئەوەی دەمەوێت ئاماژەی پێبكەم دەربارەی (ئیشو كار)ە لەپەندی كوردیدا، كورد لەدێر زەمانەوە نەوەكانی بەئازاو چاونەترسو ئیشكەر ناسراوە بەرهەمی رەنجی خۆی خواردووە، بەئارەقەی نیوچەوانی بژێوی ژیانی دابین كردووە، سەربەرزانە ژیاوە،بابو باپیرانمان لەزووەوە دەركیان بەم

راستییەکردووە کەدەبێ کاربکەی بۆ ئەوەی بژی ئەم پەندە کوریدا وشەی ئیش‌و کاری تێدایە : (ئەوەی کارنەکا ناخوا) واتە دەبێ مرۆڤ کاربکات‌و چاوی لەدەست ئەم‌و ئەونەبێ، گەر رەنج‌و نەدەی و کارنەکەی ئەوە بەروبوومەکەشی ناخۆی.

-(ئیشکەری خۆتی خۆشەویستی خەڵکی) واتە هەر چەند ئیش بۆ خۆت دەدەی‌و سوودو بەرهەمەکەی بۆ خۆتە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆشەویستی خواو خەوڵك دەبێ کەواتە باهەموو لایەکمان ئیش بکەین هەول دەین تابەئاوات وئامانجەکانمان دەگەین.( کاری بەوەختێ ، پاشای سەر تەختی): واتەمەبەستیان ئەوەبووە ئەوانەی کاری خۆیان گورج‌و گۆڵ‌و لەکات‌و ساتی خۆی بەئەنجام دەگێنن، ئەوە وەکو پاشا وانەو هەمیشە خەڵك کاریان بەئەوە نەك بەپێچەوانەوە.

لەپەندێکی تردا هەر بۆمەبەستی پەلەکردن لەکارکردندا دەڵێت:- (ئیشی ئەمرۆ مەخەرە بەیانی بەبینێ):- واتە نابێ تەمبەڵی بکەی لەئیش‌و کاردا، مەڵێ دەی دەی کاتێکی تر دەیکەم، نەخێر دەبێ هەموو کاتێ ئیش‌و کارەکان نەخرێتە بەیانی.

( دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە) واتە هەر چەند کارکردن هیلاك‌و ماندووت دەکات، بەڵام زگت تێر دەکات، واتە نان پەیدا کردن ناخۆشە، بەڵام بەرهەمەکەی بەتامە حەسانەوەی لەدوایە.

کورد لەمێژە دەرکی بەوەکردووە کەنابێ هیچ کەسێ بێ کار دانیشێ‌و لێی پاڵ داتەوە، بۆیە گوتویەتی ( گەرهیچ نازانێ، گۆپار هەرگرە لۆشوانی) واتە شتێ هەرفێر دەبێ گەرهەول دەی و بێ هۆیش نەبووەو

نابێ بۆ زیاتر هەوڵدان تا مرۆڤ كاربكات، بابو باپیرانمان ووتویانە (شەڕ لەبەتاڵی باشترە) لەم پەندەدا دەردەكەوێ كەبەهیچ شێوەیەك قبووڵ ناكرێ مرۆڤ كارنەكات هەرچەند شەر ئەوپەڕی خراپیە لەنێو كۆمەڵو كۆمەڵگاو بەڵام بەتاڵی گەلێ لەو خراپترە.

لێرەدا هەر وەك نموونە ئەم پەندانە دەخەینەوە بەرچاوتان، كە دەربارەی (ئیش‌و كار) گوتراوە:

* ئیشكەری خۆتی، خۆشەویستی خەڵكی .
* كاری بەوەختی پاشای سەرتەختی
*ئیشی ئەمڕۆ ،مەخەرە بەیانی.
* دەستی ماندوو ، لەسەر زگی تێرە.
* گەر هیچ نازانی، گۆپار هەرگرە لۆشوانی
* شەر لەبەتاڵی باشترە.

# ( زســتان )... لە پەندی کوردیدا

زستان یەکێکە لەوەرزەکانی ساڵ، کەبەوەرزێکی ساردو شووم و تووش ناسراوە، گەلێ پەندو باس و خواس دەربارەی وەرزی زستان گوتراوەو نووسراوە، من لێرەدا هەندێ لەو پەندە کوردییانە دەخەمە پێش چــــاو کەدەربارەی وەرزی (زستان)گوتراوە، بەئومێدم سودی هەبێت.

*** زستانان ئاگرو ئەز، بواران ئەزو پەز، هاوینان ئەزو رەز:**

– واتە: ئەوانە هەریەکە لەسەردەمو کاتی خۆی خۆشەو سوودبەخش‌و بەکەڵکە.

*** زستان یان سەوەشینە، یان دواوەشێنە:**

– واتە جاروایە زستان لەیەکەم جاردا سارد دەبێت، جاروایە لەدواییدا.

***زستان‌و بوار لەماڵی خۆتە:**

–واتە خۆشی‌و ناخۆشی لەماڵی خۆتە.

***زستانان خۆت گێرمەکە، بەهاران خۆت تەڕمەکە:**

– واتە مەبەست ئەوەیە بارانی زستانی درێژەی هەیەو نابێ کاری خۆت لەسەری بوەستێنی و بارانی بەهاری کێشەی نیەو پێی ناوێ خۆت تەڕ بکەیت، چونکە زوو تەواو دەبێ.

*** زستان سەر وشێن بێ، نەوەك دواوەشێن:**

–چونکە خەڵك تفاقی خۆی‌و حالاتی دێتەکۆتایی لەدوایی زستاندا بۆیە لەسەرەتای زستان چەندی توندبێ غەم ناکات، بەڵام لەدوایی دا زیانی زۆری دەبێ.

*** زستان ڕێز به‌، پایزمرێز مه‌به‌:**

– واته‌ زستان خۆت ئاماده‌و توندو تۆڵكه‌.

*** زستان هات و هه‌ژاره‌، لای ده‌وڵه‌مه‌ندیش به‌هاره‌:**

– واته‌ هه‌ژار توانای دابین كردنی پێویسته‌كانی نیه‌، بۆیه‌ خه‌می بۆ په‌یدا ده‌بێ، به‌ڵام زستان لای ده‌وڵه‌مه‌ند هه‌روه‌ك به‌هاره‌.

*** زستانان پینه‌و په‌ڕۆ، هاوینان وورد وورد بڕۆ:**

– واته‌زستانان هه‌رچۆنێ بێت خۆت گه‌رم و گوڕ داپۆشه‌ تاهاوین، له‌ هاوین داغه‌م مه‌خۆ.

*** زستانێ ته‌قه‌ل پارۆ، هاوینێ پێخواس بڕۆ:**

– واته‌ گرینگ زستانه‌ كه‌خۆت وماڵت قه‌یم بكه‌ی، هاوینان كێشه‌نیه‌ گه‌ر پێیخواسیش بیت.

***زستان خۆشه‌، ئه‌گه‌ر به‌ئیرۆبێت:**

– واته‌ئه‌ گه‌ر زستانان پێداویستی و شوێنێكی گونجاوت هه‌بوو ئه‌وه‌ خۆشه‌و باشه‌.

*** زستان هات به‌رگی فه‌قیردڕا:**

– واته‌زستان تووشه‌و سه‌رماو سۆڵه‌و به‌رگی هه‌ژارو فه‌قیر ده‌درێ‌و پێویسته‌ خۆی نوێ بكاته‌وه‌.

*** زستان لۆیه‌ك رۆژبێ زستانی خۆی ده‌كا:**

– واته‌ زستان هه‌رچۆنێ بێت گه‌ر بۆیه‌ك رۆژ بێ ساردو سڕی‌و باران‌و توندوتیژی خۆی ده‌ر ده‌خات.

# ( ئـــاو )... لە پەندی کوردیدا

ئـاو. سەرچـاوەی ژیانـەو هـەموو شـتێ لـەئاوەوە دروسـتو پێکـدێت، پیسـەکانیش بـەئاو پـاك دەبنـەوە، لەمێـژە گـوتراوەش ئـاوو ئـاوەدانی کەواتە (گرینگ)ی‌و سوودی ئاو بێ شومارەو نایێتە ژمـاردن، مـن لێـرەدا نامەوێت باسی هەموو ئەو سوودو زیانانەی ئاو بکەم کەدێتە بوون، بەڵکو ئـەوەی گەرەکمـە رۆشـنایی بخەمـە سـەر ئـەو پەنـدە کوردییانەیـە کەسەبارەت بە(ئاو) گوتراون.

بۆیە ئەمانەی خوارەوە زۆربەی زۆری ئـەو پەنـدە کوردییانەیـە کەوشـەی (ئـاوی) تێدایـە، بەئومێـدم سـوودی هـەبێ، نابـێ ئـەوەش لـەیاد کـەین کەپیرۆزی ئاو لەوەشدایە کەلەقورئانی پیرۆزیش باسکراوە، لای کـوردیش بەپیرۆزو مەزن سەیرکراوە بۆیە ئەو هەموو پەندەیان دەربارەی گوتووە:

* **ئاوێ هەوێ یان دەڕوا، هی هەوگیانان ناڕوا.**

– واتـە بـۆی هەیـە هـەوێ لەگـەڵ یـەکتردا بگـونجێن، بـەڵام دوو گیـان ناگونجێن.

* **ئاو شێلوو بوو، ڕوونابێتەوە:**

واتە کارێك تێکچوو وەك خۆی نایێتەوە، یا ناوێك بەخراپ ڕۆیی زەحمەتە ناوی بەباش بهێنن.

* **ئاویش زۆر بمێنێتەوە بۆگەنی دەبێ:**

واتە هەموو شتێ لەکاتی خۆی، زیاتر ئەمە بۆ کاری خێر بەکاردێت کەزوو ئەنجامی بدەیت، بۆ میوانیش بەکاردێت کەلەشوێنی زۆر بمێنێتەوە.

*** ئاو وەجەوەنەی ئیمام حوسێن ناكا:**

–واتە كاری چاكە ئەنجام نادا، بڕوای بەچاكەو چاكەخوازی نییە.

***ئاو بەنەرمی خۆی شاخ كون دەكات:**

– واتە مرۆڤ بەهەوڵی بێ ویچان بەئەنجام دەگات، یا بەنەرمو نیانی هەموو شتێ دێتە بەرهەم.

*** ئاوی زۆر ئاوی كەم دەبات:**

واتە: پیاوی دەسەڵاتدار بەخەڵكی زۆر كەسی بێ هێزو كەم لەناو دەبات.

***ئاو بتبا لە پردی نامەرد مەپەڕەوە:**

واتە هەندێ جار مردن هەڵبژێرە، بەڵام پشت بەمرۆڤی نامەردو سپڵە مەبەستە.

*** ئاو بەئاگرێدا كرا:**

واتە شەڕو ئاژاوە نەماو كۆتایی بەكێشەكە هات.

*** ئاو بڕوا بۆ رۆخانە خوێش (خزم) بیخوا نەك بیٚگانە:**

واتە: خزم بەهەر شێوەیەك بێت لەبیٚگانە باشترە.

*** ئاو بێنە دەست بشۆ:**

ئەمە لەكاتێكدا دەگوترێ كەكۆتایی بەشتێك هاتبێ.

*** ئاو تا لێڵ نەبێ ماسی لێ خۆش نییە:**

واتە: ئەمانەیی لەشتێ شارەزان حەز دەكەن بچنە ناخی شتەكانەوەو، تا تەواو تێی بڕوانن.

*** ئاو دەبیا دەست بەكەف وەدەگرێ:**

–واتە ئەوەی پاشەڕۆژی تازە بەتازە خۆی بۆ شتی تر ئامادەكا سوودی نییە.

*** ئاو كەزیاد بوو لەسەری دەڕژێ:**

– واتە: هەر شتێ لەقەوارەی خۆی دەرچوو بێ ماناو بێ تام دەبێ.

***ئاو لەشوێنی لێژ ناوەستێ:**

واتە: كەبەرەو لێژی رۆی بەكەس ناوەستێ، وەك تەمەنی مرۆڤ وایە

کەتوانای گەنجێتی نامێنێ.

*** ئاو لەناو جۆنی دەکوتێ:**

–واتە کارێکی بێ مانا دەکا کەشیاو نەبێ.

***ئاو لەناو دەستی ناتکێ:**

–واتە: سوودی لێ نابینرێو چی لەدەست دەرنایێ.

*** ئاو هات ئاو مالّك خۆت لادە:**

–واتە: مرۆڤی شیاو بۆ شوێنی شیاو دابندرێ، کەسانی شارەزا لەشوێنی کەسی نەشارەزا دابنرێ.

*** ئاوو ئاوەدانیان گوتووە:**

– واتە: ئەو شوێنەی ئاوی هەبێت ئاوەدانیش دەبێت.

***ئاو کەرژا کۆناکرێتەوە:**

– لەکاتێکا دەگوترێ کە کار لەکار بترازێ وەکو خۆی لێ نابێتەوە.

*** ئاوی دەکاتە ناو بێژینگ:**

واتە: کارێکی ناشیاو دەکاتو هیچ سوودی نییە.

*** ئاوی هەمیشە بەجۆگەیە:**

واتە: کاری بەرێو جێ دەکا.

*** ئاوێ کەبەجۆگەیەکدا رۆیشت هەمیشە دەبێ بڕوا:**

واتە: هەنگاوی باش سەرکەوتنی لەدواوەیە.

*** ئاوەکانی لەئاوی رووبار پاکترە، کەچی رووبار ئاوی زۆرترە.**

– واتە مەرج نییە هەموو زۆرێك باشی بێ، جاری وا کـەمیش رۆڵـی خـۆی دەبینێ.

*** ئاو مردوو و زیندوو پاك ئەکاتەوە، گڵ گلاّویان لێ ئەشواتەوە:**

–واتە: ئاو هەموو شتێ پاك دەکاتەوەو بۆ هەموو شتێ بەکاردێت.

*** ئاوەکەی شەتولەعەرەب بەخیلی بەکانیاوەکەی سەرچنار دەبات:**

–پیاوی دەوڵەمەندو خواپێدراو جاری وا بەخیلی بەکەسی هـەژار دەبـاتن یا بەشێوەیەکی تر کەسی دوڵەمەند هەندێ جار پێویستی بەیارمـەتیو

هاوكاری هەژار دەبێ.

*** ئاوی پایزان دەڵێی بەفراوە، ئەوی تێر نەخوا چی لەناوە:**

واتە ئەوەی نەتوانێ سوود لەشتێ ببینی كە لەكاتی خۆی، ئەی كەی سوود دەبینی.

*** ئاوو گلە هەڵیگرت:**

–واتە: نەماو بزربوو لەبەر چاوان وون بوو.

***ئاوی شیرین لەخاكی سوور (سوێر) دەرناچێ:**

واتە لەكەسی خراپ، چاوەڕوانی كاری چاكە مەكە.

*** ئاوت شیرین بێ، نانت گەنم بێ، ژنت هەر بووك بێ.**

ئەمە لەكاتێكدا دەگوترێ كە یەكێك كارێكی باش بكات ئەم (دوعا)یەی بۆ دەكەن، بۆ ئەوەی سەر ئاوو دەرداوە زۆر باشە واتە گێرمەو كێشەی زۆر دیوە..

# (دار)... لە پەندی کوردی

پەنـدی پێشـینان.. فەلسـەفەی کۆمەڵایـەتی خەڵکـە، هـەموو لایـەن‌و چـەمکەکانی ژیـان دەگرێتـەوەو دیارییـان دەکـات، گەنجینەیـەکی بـێ هاوتـاوو دەوڵەمەنـدی سـەدەکانی رابـردووە، پڕێتـی لـەتاقی کردنـەوەو زانیاری بەکەڵکی ئەم نەتەوەیە.

وەك دەزانـین پەنـدی کـوردی.. کورتـە ئاخاوتنێکـە بەرجەسـتەی دیـدو بۆچوونی ئەم میللەتە دەکات، ئێمەی کورد لەم رووەوە پەندی پێشینانی پڕ بایەخ‌و گرینگیمان هەیە، کەهەقە بەئاوی زێڕ هەموویان بنوسـرێنەوە، چونکە هەندبەجوانی‌و رێکی‌و وەستایی ووتراوە، کەبونەتەمایەی شانازی پێکردنی هەمولایەکمان.

پەنـدی کـوردی.. هـیچ لایـەنێکی ژیـانی فـەرامۆش نـەکردووە، جگـە لەوەوەش لەسەر هەموو کون‌و کەلەبەرێك‌و مادەیەکی سروشتی ئەم ژیان چـەندین پەنـدی هەمـەجۆرمان هەیـە، بـۆ ئـەمجارە باسـی ئـەم پەنـدە کوردیانە دەکەین کە وشەی (دار)ی تێدایە بەئومێدم کوردستان رەنگین‌و وڕازاوەتربێت بەداری بەبەرو بەرهەمدار ، پەندەکانیش ئەمانەن:

*** دار هەڵبڕە، سەگی دز دیارە:**

واتە هەندێ کارو کردەوەی نەشیاو هەیـە، زوو بـەدەر دەکـەون لـەلای مرۆڤی خراپ و دەست پیس.

*** تازە دادی، داری دەکا:**

بـەئیش‌و کارێـك دەڵـێین لەسـەرەتا دابـێ‌و زۆر دواکـەوتبێ لەلایـەن

کەسەکەوە، بۆ منداڵی تازە فێرە ببێ ئەوشە دەڵێین.

* زۆر عەداڵە، لەداری دەتاشی:

بەیەکێك دەڵێن کەزۆر تامەزرۆی شتێ بێ، بەتایبەتی بۆ لایەنی جنسی ئەم پەندە زۆر دەڵێین.

* دارێکم لەدەستە هەردووسەری پیسە:

واتە کەسێك لەدوولاوە تووشی کێشەو چەرمەسەری بێو یەك لەیەکیان خراپتربێو نەزانی چی بکات.

* دارکرمی لەخۆی نەبێ، هەزار ساڵدەژی (دار کرمی نەبی نارزی):

واتە ئەگەر گەندەلی و خیانەت لەنێو خودی نەتەوەکە نەبی، ئەوەهیچی بەسەر نایێ، هیچ شتێ بەبێ هۆنابێ.

* داری بێ بەر بۆ برین باشە:

واتە: ئەو مرۆڤانەی کەسوودبەخش وبەکەڵك نین بۆکۆمەڵ و کۆمەڵگا نەمانیان زۆر باشترە لەمانیان.

* نەبایی دیوە نەباران، کیشکولە چوونە داران:

واتە: بەبێ ئەزیت وئیش و ئازار، گەیشتە شوێنی مەبەست.

* ئەگەر بەخۆت باش بی، داری نادمیە دەست پیاوی:

واتە:ئەوە بەژنێك دەڵێن کەگەر خۆی خراپ نەبیو خراپەنەکا، ئەوە پیاوەکەی ناتوانی دارکاری بکاو لێی بدات.

* داری لەکونە زەنگەسوورە ومرمەدە تاپێوەت نەدا:

واتە: کاری خراپو نەشیاو مەکەو دەست لەئێش خەڵکی وەرمەدە، ئەگینا تێدەکەوی.

* تەق ورمقە دەرێ دارە:

واتە: بەیەکێکی لەرولاواز دەگوترێ ، کەگۆشتی بەلەشەوە نمابێ.

* چەندی دار لە پیسایی ومردەی بۆنی دێ:

واتە: کاری خراپ وباسی نەشیاو باس نەکرێودرێژەی پێنەدرێ باشە .

*** داری قەرەداغ پەلکی دەرمانە، خۆزگەم بەوخوشکەی برای میوانە:**

واتە: بەیەکێك دەڵێن خۆشەویستی‌و پشتیوانێکی مێوان بێت.

***داری لەدەست کەوتووە:**

واتە: پەکی کەوتووەو هیچی پێناکرێ ئیتر لەبەرپیری بێ یان نەخۆشی.

***داری قەلان دیارە:**

واتە: لەکاتی ئیشکردنا سەیری دوور بکات وئیش نەکات وای پێدەڵێن.

***داری دەمانچەی شکا:**

واتـــە: بەیـــەکێك دەوتـــرێ کەتەگـــەرەو کۆســـپێك هاتبێتـــە رێ‌و پەکی‌کەوتبی.

*** دار دەدەن بەدەمیەوە:**

واتە: دەستی بۆشل دەکەن بۆیە بێ شەرمی دەنوێنێ.

*** دار نەگرێ، سەر نەچەمێنێ:**

واتە پیاوی گەورەو خزمەتگوزارو وەجاخزادە، هەمیشە خۆی بەکەم و نزم سادەدائەنێ.

*** دار بەسەر باریا کراوە:**

واتە لەهەژارێکی بێ دەسەلات دەوترێ، کە هەرکەسێ هەڵستێ دەستی لێ بوەشێنێ .

***دار خرە بەرزبێتــەوە، دەچەمێتەوە:**

واتە: هەرکەس بەرز بڕوانێ نزم ئەدا لەزەوی ، یان هەموو هەورازێك نشێوییەکی لەدوایە.

*** داری ( حەد ) ئازاری نیە:**

واتە: حەد هەق، یان سنوورە،واتە ئادەمیزاد نابێ لەهەق لاری هەبێ.

***دارێکی لەسەر بەردێکە دانانێ:**

واتە: بەکابرایەکی بێ کارو تەمبەل دەگوترێ، لەماڵە دانیشتبێ و هیچ ئیشی‌و کارنەکات.

* داری بگوشی، ئاوی لیّ دەیێنیّ:

واته: بەكابرایەكی بەهێزو دەسەلاتدار وتوندو تیژ دەڵێن.

* دار به پیری ناچەمیّ:

واته: مرۆڤیش لەكاتی منداڵو هەرزەكاری رەوشت وەردەگریّ، بەپیری و گەورەی ئاسان نییه.

* دار هەڵبدەی بەر زەوی ناكەوێت:

واته: بۆ قەرەبالغی بەكاردێت.

* دار كەكرمی بوو شكانی مسۆگەرە:

واته: هەرشتیّ كەگەندەل بوولەناو دەچیّ.

*داركلكی لەخۆی نەبیّ نابردریّ:

واته: (بیور) ئەگەر كلكی دار نەبی ناتوانی داریبڕی، واته هەرشتێك لەناو خۆی نەبی شكانی ئاسان نییه.

* داری هەلاوی سەگی حیزبەخۆی رادەكات:

واته: لەكاتێكدا دەگوتریّ كابرایەك گومانی لێبكریّ و بەخۆشی هەندیّ كاری پەرتاوان بكات.

* دار بەبەرەكەی دەناسریّ:

واته : مرۆڤ بەپێیّ بەرهەمەكەی دەناسرێت:

*دار گەندەربی، بیور تیژبی، یار لیدیاربی:

واته: بەئێش و كارێك دەگوتریّ لەهەموو لا قازانجی بیّ

* دار لەجێی خۆی راقەنیّ، هێشك دەبی:

واته: كەشوێنی خۆت لەق كرد لەپەلو پۆدەكەوێت.

* دار نەبی، رەژوو لەكیّ بوو.

– بۆكارێك بەكادرێت بنەڕەتەكەی نەبێت وداوای شتی تری لیّ بكرێت.

* داری لەجێی كول دەژەنیّ:

واته: بەكەسێك دەلێن یەكێك هان بدات ودڵیّ بكولێنتەوە.

* دارێکم چاندبەرم لێ نەخوارد

واتە بۆ لەرێگا یەك ماندووبون و بەرلێ نەخواردن بەکاردێت

*دار لەدمووی ومرمەدە:

واتە: قسەی لەگەڵ مەکەو وازی لێبێنە.

* دار لەگەڵ تۆمە، دیوار گوێت لێ بێ:

واتە قسە لەگەڵ یەکێك دەکەی بەیەکێکی تر دەڵێی گوێت لێبێ.

*دار ئەستوور نابێتە گۆپاڵ:

واتە هەموو شتێ لەقۆناغو سەردەمی خۆی بەسوودە

* داری بەسەربەردیدانەمایە

واتە: تواناو هێزو کەڵکی نمایە.

* داری بن پتەو، لەبای بەهێزو دژوارناترسێ:

واتە کەسانی خاوەن باوڕو توانا لەمەم لەو ناترسێ.

* دار ی بێ مێوە:

واتە: سوودو کەڵکی نییە.

* دارەك لەسەر سەگ، سەد دار لەسەر ژن:

واتە: مەبەستی ئەوە چاودێری ژن زیاترەو پێویست ترە لەهی سەگە، بەڵام بەخۆم زۆر لەگەڵ ئەو پوندانە نیمە

* داری درێژ سەر نانوێنێتەوە:

واتە کەسی سەر بەرزو سەرفراز، بۆ کەس سەرشۆرناکات.

* داری راستیش رەگی چەوتی هەیە:

واتە: هیچ مرۆڤی بێکەمو کورِێ و هەڵەنابی

* داری سواڵی دایە دستی

واتە: ئیشەکە بەدەستی خۆی ناکاو دەیداتە دەستی یەکێکی تر.

* داری هیشك بەری نییە:

واتە: مرۆڤی رەزیل وبێ سوود کەس قازانجی لێ ناکات.

# (كـــەر)... لە پەندی كوردیدا

كەر... كەگوێدرێژیشی پێدەڵێن.. گیانلەبەرێكی گوێڕایەڵو لەسەر خۆیە، مرۆڤ كاتی خۆی زۆر سودی لێبینیوە، بۆ بارهەلگرتنو گەڕانو سوڕان، لەجیاتی ئۆتۆمبێلی ئێستا بوە.
كەر ناخۆشترین دەنگی هەیە، ڕووخساریشی زۆر بەرچاونیە، لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی خۆی دەناسێ، گوێڕایەڵی دەبێ، من نامەوێ باسی سوودو زیانەكانی كەر بكەم، ئەوەی گەرەكمە دەبارەی ئەو پەندە كوردیانەیە كە ووشەی(كەر)ی تێدایە.

*** كەرەكەی من لەهەسپی ماری میری باشترە.**

– واتەماڵی خۆت زۆر لەهی خەڵك باشترە هەرچۆنێ بێت وەك دەڵێن سواری خەڵك پێدەیە.

*** كەر بەتڕینێ لەدەست گاوانی ڕزگارنابی.**

– واتە بەشتێكی ئاسایی لەبن دەستی ڕزگارنابی.

*** كەر تێر بخوا، لوشكان داوێت.**

– واتە كەسانێك هەن كەتێرو دەوڵەمەند بوون هەڵە دەكەنو فیزیان زل دەبێت.

*** كەرم نیە، كام لۆچیە.**

– واتە ئەگەر پێویستت بەشتێك نەبوو بانەت بێت باشترە.

*** كەر نازانی بۆنی بیی چیە.**

– واتە كەسانی نەزان چاكو خراپ لێك ناكاتەوە.

*** کەری خەساش بایی خۆی کاردەکات.**

– واتە هەرچۆنێ بێ دەبێ لەوژیانە هەولبدەی و کاربکەی، ئەگینا بۆت ناچێتە سەر.

*** کەری خۆم لەهۆشەی دەناسمەوە.**

– واتە یەکێ خاوەنی شتێ بێت تەنها بەقسەیەك دەیناستەوە.

*** کەری قەرس، بەسوژنێ بازۆ.**

– واتە هەرشتێ بەشتی خۆی دێتە رێ.

***کەری لەکن رەوسەی جۆی ببەستیەوە، سنگی هەردەقەنی.**

– واتە چاوی لێدەبیو خۆی پێناگیرێ، بۆیە تاو دەداتێ.

*** کەرێ هەر لوشەلوشە، نەکاما نە پوشە.**

– واتە ئەوەی برسیو بێحاربی، چاوی تێرنابی بەهیچ شتێ.

*** کەری مەلای لەناوکەران بەهێستر حیسابە.**

– واتە کەسی زاناو نەزان کەرەکەشی جیایە لە کەسانیتر.

*** کەرەکەمان لەسەرتاوە کلکی نەبوو.**

– بەکارێك دەوترێت کەلەسەرەتاوە تەواو نەبێت.

* کەری چاك لەدەست گلێ فرۆشە.

– واتە هەندێ شتی باش دەکەوێتە دەستی نەزانو نازانێ رێزی بگرێ.

*** کەر بباتە سەرکانی کورتانی دهێنێتەوە بەشانی.**

– بەرۆژێکی زۆر ساردی زستان دەوترێت.

*** کەر بەکەردە، خرمی خرمی زێدە.**

– بەیەکێك دەوترێت، کەلەجێی یەکێکیتر دانرابێت، بەلام لەو خراپتر بێت.

*** کەری لەکن کرێ ببەستیەوە، یان خەسرەتی دەگری یان رەنگی دەگری.**

– واتە خو وڕوشتیان وەکو یەك لێدێ.

*** کەرەکەوەی کەرگەل لەگورگ وەڕ.**

– بەیەکێك دەوترێت کەسەری زۆر کەسی نابێتە چاڵ.

* كەری كەوتوو، باری‌نیە.

– واتای بێ هێزیو توانایی ئەگەیەنێ.

* كەر بەفیتەفیت تێر ئاونابێت.

– واتە مرۆڤ بەقسان تێر ناخوا.

* كەر بزەڕێ سەگ پشتی دێشێ.

– چونكە سەگ چاوەڕوانی كەر دەكات كەبتۆپێ تابیخوات، وەكی بزەڕێ ئەوەدەگەیەنێ كەوا هێشتا لەهێزو توانادایەو پێی ناخۆشە.

* كەر بەباری سوكەوە نازانێ ڕێ بكات.

– بەنەزانێكی مەینەتبار دەوترێت كە كەتبێتە حەسانەوەیەكەوەو نەزانێ هەڵسو كەوتی تیابكات.

* كەر بەلاباران ناگاتە هەواران.

– بەیەكێ دەوترێت كەدەستی دابێتە كارێكی گرانەوەو پەكی كەوتبێت.

* كەر بەنەقیزە، ژن بەتڕێزە.

– واتە كەر بەنەقیزە دەڕوات، ژنیش بەقسەی خۆشو گرینگی‌دان پێی دەڕوات.

* كەر تڕیو ماڵ وێران.

– لەكاتێك بەكاردێت كەنەزانێك ئیشێكی لێتێكدابێت.

* كەر كوڵو بارسەبەتە، ماڵی كەبیخوا ئەوەتە.

– واتە هیچی لەبار نماوە.

* كەر كە زەڕاندی، گورگ بۆخۆی پەیدادەكات.

– واتە پیاوی نەزان بەقسەی خۆی تێدەكەوێ.

* كەرو بارت بەخێر بێتەوە.

– لەڕووی گاڵتەوە بەیەكێكی ئەڵێین كە ئیشێكی ناپوختەی كردبێت.

* كەر ئەوكەرە، كورتانەكەی گۆڕاوە.

– بەشتێك دەوترێت كەدیمەنەكەی گۆڕبێ، بەڵام شتەكە هەروەك خۆی وابێ.

*** کەر نەودیە لەکاروانسەرادا بزمڕێ.**

– کەر لەسەفەر بگەڕێتەوە، زۆرماندووە، وەڕودەکاتە کاروانسەرا، کە(تەوێڵەیە) ئینجا ئەگەر لەوێ زەڕی، ئەوە نیشانەی بەدەقیو بەهێزیەتی، واتە ئازا ئەوەتا لەڕۆژی بارەبەریدا ئازابێت.

*** کەر بترێ کۆشی بۆ ئەگرێتەوە.**

– بەیەکێکی زۆر هەژار دەوترێت.

*** کەربکەوێ، ددانی دەشکێ.**

– بەشوێنی بێ لەوەڕ دەوترێ.

*** کەر بارەکەی تفەنگیش بێت، گورگ هەردەیخوات.**

– واتە نازانێ بەکاری بێنی، بەیەکێك یابە گەلێك دەوترێت کەجەنگاوەر نەبێت، وەنەزانێ چەکی جەنگی بەکار بێنێ.

*** کەر بۆنی زەعفەران نازانێ.**

– واتە مەردومی تێنەگەیشتوو لەشتی ورد ناگات.

*** کەر بە پە یخام ئاو ناخواتەوە.**

– واتە کەر بەبێ ووتن ئاو ناخواتەوە، ئەیەکێك دەوترێ کە ئامۆژگاری کاری تێنەکات.

*** کەر بەجۆ بمرێ شەهیدە.**

– بەیەکێکی نەوسنی چڵێس دەوترێ، کەلە زۆر خواردنەوە نەخۆش کەوتبێ.

*** کەر بەحەج نابێ بەحاجی.**

– چونکە چۆن دەچێ، هەرواش دێتەوە.

*** کەر بەدەنکە جۆیەك ئەزمرێ.**

– بەیەکێك ئەوترێ کەزوو لەخۆی بگۆڕێو یاخی بێ.

*** کەر بەستە خاوەن ڕستە، یادەڵێن (کەر بەستە، لەخەم ڕستە).**

– بەیەکێك دەوترێت کە کەرخۆی بەستبێتەوە، واتە ئیشی خۆی بنج بەستکردبێ، وەبێ غەم دانیشتبێ.

*** كەر بەكاروان قەڵەونابێ.**

– بەهەژارێك دەوترێ، كەبەرێكەوت لەلایەكەوە خواردنێكی دەیست كەوتبێ.

*** كەر بەنەقیزە نەبێ، ناڕوا بەرێوە.**

– بەمەردومی تێنەگەیشتوو دەگوترێ، كەبۆ هەموو شتێك دەبێ پێی بوترێ.

*** كەر بێ كورتان نابێ.**

– واتە هەموو گیانلەبەرێك بەجلی خۆیەوە دەبێ.

*** كەر لەكاروان بەجێ بمێنێ، كلك و گوێی دەكەن.**

– واتە هیچ كەسێك نابێ لەدەستەی خۆی دوابكەوێت.

*** كەر لەكاروان بەجێما گورگ دەیخوات.**

– واتە تادەتوانی لەگەڵی خۆت بڕ مەبەو لامەدە.

*** كەر لەكاروان گڵ دەداتەوە.**

– بەخاوەن قەرزی بێ ئینساف دەوترێ.

*** كەر لەكێ كەوتوە، كوندە لەكێ دڕاوە.**

– بۆ قسە دەوترێ كەپەیوەندیان بەیەكترەوە نەبێ.

*** كەرم دا و هوڕم دا، خۆم بۆگوریس بەلێدان دا.**

– بەیەكێك دەوترێ كەدەست لەشتی گرینگ هەڵبگرێ، كەچی لەسەر شتی بێكەڵك زۆر چەقەچەق بكا.

*** كەر مردگ، خاوەن ناڕازی.**

– بەیەكێك دەوترێ كەهیچ دریغی نەكردبێ لەوكارەی كەپێی سپێردرابوە،كەچی خاوەن كارەكە لێی ناڕازیبێ.

*** كەرو جاشك قلیان قاوەلتیەتی.**

– واتە ئیجگار زۆر خۆرە.

*** كەرو خۆڵە مێش.**

– بەدووكەسی هیچو پوچ دەوترێ، كەهەمیشە پێكەوەبن.

*** كەرو ماچومیان نەوتووە.**

– بەیەكێك دەوترێ كەلەگەڵ كارێكا خەریك بێ، هیچیشی لێنەزانێ.

*** كەر لەقورا ئەگێت.**

– بەیـــەكێك دەوتـــرێ كەیـــەكێكیتر بگـــرێ بەپرســـیارلێكردنی، یابەداوالێكردنی شتێك لێی لەكاتێكی تەنگو چەڵەمەدا.

*** كەرە مەمرە بەهارهات كورتانت لۆ لەشارهات.**

– بەیەكێك دەوترێ كەبێ هیوابێت، دەڵێن بێ هیوا مەبە.

*** كەری بەتاڵ خێرا دەڕوا.**

– لەڕووی سوكیەوە بەیەكێك دەوترێ.

*** كەری خۆت بەستۆتەوە.**

– بەیەكێك دەوترێ ئیشی خۆی بەتەواوی جێبەجێكردبێ.

*** كەر تا دەتۆپی لەلەقەوشاندن ناكەوی.**

– بەیەكێكی خراپ دەوترێ كەتا مردن دەست لەكاری خراپ هەڵناگرێ.

*** كەر تۆپیوەو شایی سەگە.**

– بەیەكێكی دەوڵەمەندی بـێ ژێـر دەوتـرێ كـەبمرێ, وە كەلەپورەكـەی بمێنێتەوە بۆ چەند خزم كەسێكی خراپ.

*** كەر جۆی دەوێ، جۆش ئاو.**

– واتە هەر شتێك پێویستی بەشتێك هەیە.

*** كەر چیەتی لەنوقل و نەبات، مشتێ جۆو كونجی ڕبات یـا دەڵـێن(كـەر قـەدری نوقـڵ نازانێ).**

– واتە هەموو شتێك شایستەی هەموو كەسێك نیە.

*** كەر دوو ڕیال، كورتان سێ قران.**

– بەیـەكێك دەوتـرێ كـەجڵو بـەرگێكی لەبـەردابێ لەئەنـدازەی خـۆی زیاتربێت.

*** كەر زاوە كوڕی بوە.**

– لەڕووی گاڵتەكردنەوە بەكوڕی یەكێك دەوترێ.

* كەر قەڵەویش بێت گۆشتی ناخورێت.

– بەیەكێكی دەوڵەمەندی رژد دەوترێ كەبەدرێژایی ساڵ پولێكی لەدەست نەبێتەوە.

* كەر كوڵو بارسووك.

– بەیەكێك دەوترێ كەسەڵتو قوڵت بێو باری سوك بێ.

* كەر كەبەبارەوە كەوت بەكلكی ڕاست دەكرێتەوە.

– واتە هەركەسێك یاهەر گەلێك كە كەوت، كاتێك ڕاست دەبێتەوە، بەیارمەتی یەكێكیتر كەخۆی مایەی ڕاست بونەوەی تیابێت.

* كەر كەتۆپی قەل لە پێشا چاوی كوێردەكا.

– واتە داگیركەر كەهاتە سەر گەلێكی دواكەوتو، پێشەكی بیروباوەڕی ئایینیو نیشتمانی لەناو دڵو دەرونیان ئەروخێنی، چونكە نیشانەی ژیانیانە.

* كەر كەجۆی دی، كا ناخوا.

– بەیەكێك دەڵێن لەڕووی سوكیەوە كەخواردنی لەبەردەمابوو لەخۆشەكە بخوا لەناخۆشەكە نەخوا.

* كەر كەنۆی برد دەش دەبا.

– یەكێك دەیڵێ كەخۆی باری ژیانی قورسو گران بێ، كەچی سەرەڕایی ئەوە سەربارێكیتری لەسەردارنرێ.

* كەری بێخاوەن، باركێشی گاوانی.

– بەشتێكی بێخاوەن دەوترێ، كەیەكێك بەكاری بهێنێو بەهرەی لێوەرگرێ.

* كەری پیرو هەوساری تۆ، زەرە زەرێتی لەدەوری جۆ.

– بەپیاوێكی پیر دەوترێ، كەخۆی هەڵیاچیبێو بەرگی تازەی لەبەركردبێ، لەدەوری ژنێكی تازەبێ مارەی بكات.

* كەری خۆمە گوێی ناڵ دەكەم.

– یەكێك ئەیڵێ كەكارێك بكات، پێی بڵێن وامەكە، واتە من بەئارەزووی

خۆم دەكەم.

*** كەری دێزە حەز بەتۆپینی خۆیو زەڕینی خاوەنەكەی دەكات.**

– بەیەكێك دەوترێت كەزیان بەخۆی بگەیەنێ بۆئەوەی زیان لەیەكێك بدات.

*** كەریشی پێدەگیٛو شایە تمانیشی پێدێنی.**

– بەیەكێك دەوترێ كەدووشتی پێچەوانەت پێبكات.

*** كەرێك بە پارەی بەفر بكڕێ لەئاوا دەخنكێ.**

– واتە هەرچی بەپارەی خزم كڕا، خێرناداتەوە.

*** كەرێ كەببەیتەسەربان، دەبێ بشیهینیە خوارەوە.**

– واتە هەركەسێ ئیشی بێجێ بكا دەبێ ڕاستیشی بكاتەوە.

*** كەرێكم دا بەكەرێ، سنگان لەبن گوێی دەرێ.**

– بەیەكێك دەڵێن، ئاڵوگۆڕیەك بكات بێ ئەوەی سودی هەبێ.

*** كەری ناوجۆگەیە، لەهەردوولا دەخوات.**

– بەیەكێك دەڵێن لەبەینی دوو كەس بێتو بچێ سودیان لێببینێ.

*** كەری ماندوو، بەتەمای وەشەیە.**

– بەیەكێكی سووك دەوترێ، كەلەكارێكا ماندوو بووبێ.

*** كەری كێ تۆپیوە.**

– بەیەكێك دەڵێن كەكارێكی باش بكاتو لێی نەوەشێتەوە.

*** كەرەكت بوو، غەمەكت بوو.**

– واتە هەرشتێكت زیاد بوو، ماندووبونو غەمی دەوێ.

# (ژماره هەزار)... له پەندی كوردیدا

(ژماره)كان لەپەندی كوردیدا پانتایەكی باشیان داگیركردووەن بەرۆم بۆ ئەم جاره بەس باسی ژماره (هەزار) دەكەین.
لەم نموونانه (هەزار) لەپێشەوەی رستەی پەنده كوردیەكان هاتووه.

*هەزار دۆستت هەبێ كەمه، یەك دوژمنت هەبێ خەمه:

– هەزار دۆستت هەبێ كەمه، یەك دوژمنت هەبێ خەمه واته پیاو دوژمنی هەبێ ناخۆشه.

* هەزار گۆزه دروست بكاتن یەكێكی دەستوی نییه.

– واته: شارەزایی نیه لەكارەكه

* هەزار فاتیحه، بەمووچەیەك حەلوا.

– واته بۆ خواردنەكەیه خۆی هیلاك دەكات

* هەزار ئەحمەدو مەحموود دەكات.

– واته ڕاڕایه

* هەزار قوڕو چڵپاوی بەقنگا هەڵووه.

– واته: كێشەو ناخۆشی زۆر دیتووه

* هەزار فاكت بەفیكێكی.

– واته: هەزا رقسه ركدوویەك ناهێنی

– لەم پەندانەشدا پتی(له)ی لەپێشدا هاتووه:

* لەهەزار ئاشی ئەكات، ئاش ئامالێتەوه.

– واته: كارێك دەكات بێ سووده

* لەهەزار ئاوی داوە، قولە پێی تەڕ نەبووە.

– واتە: لیزانانە کارەکان دەبات بەڕێوە

لەم دوو پەندەشدا لەناوەڕاستی پەندەکە هاتووە.

*تا پیرێك دەمری، هەزارجوان دەمری؟

– واتە: مردن بەتەمەن نییە.

* دار کرمی لەخۆی نەبی هەزار ساڵ دەژی.

– واتە هەرمیللەتی خیانەت لەخودی خۆی، نەبێ سەردەکەوێو زەفەری پێنابردرێ

* قسە هەزار دووانی بەکارە.

– زۆر گوتن سوودی نییە

* پیریو هەزار عەیب.

– واتە پیاو کەپیر بوو تووشی هەزار نەخۆشیو عەیب و عار دەبێت.

# ( ژمارەی حەفت )... له پەندی كوردی

هەرمیللەتو نەتەوەیەك بەجۆرێ بیردەكاتەوە لەژمارەكان، ژمارەش كاریگەری خۆی بەجێ هێشتووە لەهەموو رووێكەوە، ئەوەی من گەرەكمە ئەمجارە باسی بكەم دەربارەی ئەوپەندە كوردییانەیە كەژمارە (حەفت یا حەوت)ی تێدایە، بەئومێدم سوودی هەبێ پەندەكانیش ئەمانەن:

***حەفتی بمری لەباوان،كلی نابڕێ لەچاوان:**

– واتە: ئەوپەندە بۆ ئافرەتێكی دڵ تەڕو لەخۆخەفتی بەكاردێت، واتەگوێی لەپرسەو ناخۆشیەكانی رۆژگارنییە، گرنگینك بەجوانی روخساری دەدات، بەتایبەتی چاوەكانی.

*** حەفتت بین بەبوونێ، یەكت نەبێ بەچوونێ چوونێ**

– واتە: ئەم پەندەش هەربۆژنان بەكارهاتووە، واتە ژن بەمندالٚ بوون تێك ناچێ، كە رحەفت مندالێشی ببێ، گوێی لێ نیە، بەلام یەك منالی لەبار بچێ، پێوەی دیارە.

*** بەحەفت ساران كورمك ئەویش بۆرە جرمك:**

– واتە: ئەوە بەكارێك دەگوترێ كەپاش چاوەڕوانیەكی زۆرو هیلاكیەكی بێ شومار، كەچی كارەكە ئەنجامەكەی پوچو بێ ماناو هیچ بێ، واتەشتێكی بێ سوودی لێ بێتە جێ.

*** حوشتر بشمرێ، باری حەفت كەر هەردەگرێ:**

– واتە: كەسی بەتوانا وژیرو بەهێز، هەرچۆنێ بێ لەكەسی ناژیرو ناتێگەیشتیو بێ هێزو گێل باشترە، واتە مرۆڤێكی سوودبەخشی مردوو

لەکەسێکی بێ دەسەڵات باشترە.

*** ژنیان کردە کوێخا، ساڵێ حەفت جار بزنی بڕیوە:**

–واتە: ئەم پەندە هەمووژنێ ناگرێتەوە،بەڵام هەندێ ئافرەت هەن کە دەسەڵات وەردەگرن چ لەماڵ یا لەشوێنی کارەکە تێك دەچێ، ئەم پەندە لەوکاتە دەگوترێ کەکارێکی نەشیاو بکرێ.

*** یاخوا لەحەفت چیایان ئاوا دەبوو:**

واتە:ئەو پەندە بۆکەسێکی شەڕانگێزو خراپەکار دەگوترێ: ڕەنگە ئەوکات حەفت چیا بەشوێنێکی دوور وترابێ.

*** حەفت جیران لەهەردوو لای ماڵەکەت میراتگرە:**

– واتە: هاوسێی باش لەبرای خراپ باشترە.

*** کاری حەفتە،بەختی چەقتە:**

–واتە: ئەو پەندەبۆ کەسێکە کەهەرکارێك دەکات تێدا سەرکەوتوو نابێ: چونکە دوودڵو ڕاڕایە لەسەرکارێك بەردەوام نابێ، یاهەند بێ بەختە دەست بۆ زێڕ دەبات لێی دەبێتە خۆڵ.

*** ئامادەبوو جوتێ کەوشی نەبوولە پای، کەمرد حەفت بوو لەسەرینای:**

– واتە: بۆ کەسێك بەکاردێت تالەژیاندا بوولەبەر دەست کورتی کەسی نەبوو بەڵام کەمرد بۆمیراتی خزمی لێ پەیدابوو.

*** گندۆرەی حەفت مانگییە:**

– واتە: بەیەکێك دەگوترێ کەوا هەردەم پۆشتەو پەرداخ بێ.

*** کافری حەفت دنیای پێ موسڵمان دەبوو:**

– واتە: بۆ کەسێك بەکاردێتن کەتووشی کارەسات و نەهامەتیەکی کوشندەوزۆر هاتبێ، نەتوانێ خۆی لێ بگرێ،

*** لەحەفت کانیان چاوی دەشوا:**

– واتە: بۆ کەسێکە کەکاروباری بەرێك و پێکی بڕوا.

# (ئاگــــر)... له پەندی كوردیدا

ئاگر.. پاش پەلیەكی گەرمی دێته بوون، سوودو زیانێكی زۆری هەیە بۆ مرۆڤ گەر ئاگرنەبێت،هیچ شتێ بەخاوی ناخورێت، بەڵام ئەوشتانەی كەپێویستیان بەكوڵان و برژان هەیە، بەهۆی ئاگرەوە ساز دەكرێت، لێرەدا باس لەو پەندە كوردییانە دەكەین كەووشەی ئاگری تێدایە.

*** ئاگر تێبەردەی، بۆن سۆی لێ نایێ یادەڵێن( ئاگرلەماڵی بەربێت، بۆن سۆی لێ نایەت ):**

– بەیەكێك دەوترێ، كەزۆر هەژارو رووتو قوتب بێ.

*** ئاگر سورێ، لەخۆم دووری یادەڵێن (ئاگرە سوورە لەخۆ دوورە ):**

– واتە یەكێك دەیلێ، كە ئاژاوەیەك قەومابێو خۆی تیانەبێ.

*** ئاگر لەكای كۆن بەرنەبێ، یا دەڵێن( ئاگر نەچێـە كای كۆن ).**

– بەكۆنــەی عشــاقێك یاخەفــە تبارێــك ئــەوترێ، كەعەشــقەكەی یاخەفەتەكەی تازە بووبێتەوە.

*** ئاگر لەچاوی ئەبارێ ، یا دەڵێن ( ئاگر لەچاوی ئەبێتەوە ):**

– بەیەكێك ئەوترێ، كەئەوەندە تورە بووبێ، چاوی سوور هەڵگرابێ.

*** ئاگر كەتەوە، ئاگر بڕ ئەكرێ**

– واتە تەڕو وشك پێكەوە ئەسوتێ

*** ئاگر ئەكاتەوە**

– واتە زۆر تورەیە.

*** ئاگر لەكولكی داری دەمینێ:**

– واتە كەسانی پیرو بەناوساڵان چوی تاقیكردنەوەو ئاقل وزانست زیاتر

لەلای ئەوان ئەبێ، چونکە زۆر شتیان بەسەر هاتووەو بەتەجرووبە زۆرشتیان بۆ روون بووەتەوە

*** ئاگر نەگەیشتە جێگا دوکەلی لێ هەڵستا:**

– یانی لەژێر ئەم کاسەیە شتی تری تێدایەو بۆ فروفێل بەکاردێت.

*** ئاگر نەگەر ولآتی داگرت تەڕ, هیشك دسووتێنێ:**

– زۆر جار وادەبی لەناو رووداوێك خەڵکی بێ تاوان تێ دەچێ، ئەوە لەوکاتەدا دەگوترێ.

*** ئاگر دامانا، مرۆڤی بەر بیتە مرۆڤی:–**

– ئەگەر مرۆڤ لەدەست و پێوە دەورویەرو نزیکانی خۆی زەفەری پێ نەبردێ، کەس ناتوانی زەفەری پێبا.

*** ئاگرمکی وامەکەوە، پینەکوژێتەوە:**

– واتە شەرو شۆرمەنێوە، یاکارێك مەکە پێت تەواونەبی.

*** ئاگری بەسکە چیلێ:**

– واتە : بەکارێکی سادە دەگوترێ.

*** ئاگری کە رمدنیان، لەشکری فەقێیان:**

– واتە ئاسایی و تەواونەیە.

*** ئاگر لە سەفین ، مە نجەلی ناولێرە:**

– بەکارێك دەگوترێت ، بەهیچ جۆرێك نەکرێت.

*** ئاگری ئێوارە لەهی بەیانی بە پیت ترە:**

– واتە شتی دوایی بەپیترە.

*** ئاگری دیزە خۆش دەکات:**

– واتە: هەولی ئاژاوە وشەڕ دوویەرەکی دەدات.

*** ئاگری نابە پوارەوە:**

– واتە بەزمێکی ساز کرد

*** ئاگربێ دووکەل نابی:**

– واتە هیچ شتی بێ بەرو بووم نابی.

*** ئاگروبایان نەگۆتییه:**

– واته دووشتی پێچەوانەی یەكتربن.

*** ئاگری بن كایه:**

– بەیەكێكه ئاژاوه گێر دەڵێن ، كەلەژێرەوه شەڕ خۆش بكا.

*** ئاگری لەماڵێ بەردا.**

– واته ماڵی خراپ كرد.

*** ئاگر نیشانەی وێرانییه:**

– مەبەستیان لەشەڕو شۆڕه

*** ئاگر بەناوی پیسش دەكژوێتەوه:**

– واته پیاوی مەرد هەندێ جار بەپیاوی نامەرد لەناو دەچێ

سود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

- پەندی کوردی، عومەر شێخەڵڵا دەشتەکی.
- پەندی پێشسینان کورد، عەلی مەعرووف شارمزووری
- چەند نامەی ئاوارە لەوتە بەنرخەکانی باو باپیران ( محەمەدی مەلا قادر )

# نوالەی نوێ

گۆڤارێکی مانگانەی رۆشنبیری گشتی - ئەهلی یە -

**خاوەنی ئیمتیاز : هۆشیار نوری لەك ـ سەرنووسەر : ناری ناغۆك**

تا ئێستا وێرای چەندین چالاکی ئەدەبی و رۆشنبیری ئەم کتێبانەشی بەچاپ گەیاندووە:

| ز | نــاوی کــتێب | بابــەت | نووســـەر |
|---|---|---|---|
| ١ | سەفەرە تاڵەکەی من و دوعا شیرینەکانی دایکم | شــیعر | ناری ناغۆك |
| ٢ | گەنج و گرفتە دەروونیەکان | دەروونزانی | یوسف عوسمان حەمەد |
| ٣ | ٧٧٧ مەتەڵی کوردەواری | فۆلكلۆر | هۆشیار نوری لەك |
| ٤ | چرکەیەك تەمەن | شــیعر | رێدار کانەبی |
| ٥ | کاتێ شیعر دێتە گۆ | شــیعر | عەبدال شێخانی |
| ٦ | هەگبەی مێژوو | کتێبی مێژوویی | هۆشیار نوری / شەیدا شێخانی/ ناری ناغۆك |
| ٧ | قەســیدەی چەپکـــە گــــوڵ | شیعری ئایینی | مەلا عومەر مەزڵووم |
| ٨ | دیــوانی نوالـــەی نـــوێ | شــیعر | ( ١٠٦ ) شاعیر |
| ٩ | رەنگاو رەنگ | شیعری منداڵان | منداڵان |
| ١٠ | سەمفۆنیای گریانێکی بێ دەنگ | شــیعر | ژیان بابەگوڕگوڕ |
| ١١ | گەنج و گرفتە دەروونیەکان ( چاپی دووەم ) | دەروونزانی | یوسف عوسمان حەمەد |
| ١٢ | هەگبەی زانین بۆ زانستە پێوانەییەکان | زانیــاری | زانا عەلی محەمەد |
| ١٣ | چاوەڕێ .. لە شەوانی فرمێسکی وشەکاندا | شــیعر | سالار عەبدولرەحمان |
| ١٤ | ماڵئاوا گوڵی خەم | کورتە رۆمان | د. هیمدادی حوسێن |
| ١٥ | ( ٩٥٥ ) مەتەڵی کوردەواری | فۆلكلـۆر | هۆشیار نوری لەك |
| ١٦ | هۆنراوەکانی ووشیار عەبدوڵڵا | هۆنراوە | ووشیار عەبدوڵڵا |
| ١٧ | خۆشەویستی کچێك لەزانکۆدا | کورتە رۆمان | شاخەوان عەلی حەمەد |
| ١٨ | بژاڤی تەغریبی | کتــێب | ناری ناغۆك |
| ١٩ | وتە ئەنماسیەکان | وتـــــە | تەحسین خالید |
| ٢٠ | عەشقی نێوان مامۆستاو کچە قوتابی | کورتە رۆمان | شاخەوان عەلی حەمەد |
| ٢١ | مـــن و تـــۆ | شیعری گۆرانی | چرپە خۆشناو |
| ٢٢ | من بەدزی باوکم گەورە بووم | کورتە چیرۆك | یوسف عوسمان حەمەد |
| ٢٣ | خۆشەویستی کچێك لەزانکۆ ( چاپی دووەم ) | کورتە رۆمان | شاخەوان عەلی حەمەد |
| ٢٤ | شاعیرێك خۆشیدەویستی | شــیعر | نــاری نــاغۆك |



# هۆشیار نوری لەك

- لەدایك بووی ساڵی 1973.
- لەدوای راپەرینەوە لەبواری راگەیاندن و هونەرو وەرزش كاردەكات.
- چوار پێشانگای كردۆتەوە، تایبەت بە(فۆلكلۆر)و(پۆستەرو بڵاوكراوەكان).
- سەرۆكی سەنتەری رۆشنبیری بەهرەیە.
- خاوەن ئیمتیازی گۆڤاری (نواڵەی نوێ) و (نواڵەی وەرزشی)یە.
- بەڕێوەبەری نووسینی بڵاوكراوەی (هونەرستان)ە.
- ئەندامی سەندیكای هونەرمەندانی كوردستانە.
- ئەندامی كارای رۆژنامەنووسانی كوردستانە.
- ئەندامی فیدراسیۆنی رۆژنامەنووسانی نێودەوڵەتییە.
- ئەندامی بزاڤی رۆشنبیرانی نوێخوازە.
- كارمەندە لە بەڕێوەبەرایەتی ئاوی هەولێر.

## * ئەم كتێبانەی بەچاپ گەیاندووە:

- مەتەڵی كوردەواری (شەش بەرگ) و (دە چاپ).
- فەرهەنگی گەنجینەی كەلەپوور.
- هەگبەی مێژوو.
- رەنگاو رەنگ.
- گوڵبژێرێكی پەندی كوردی.
- چەند دەستنووسێكی تری ئامادەیە بۆ چاپ.





لەسەر ئەركی سەنتەری رۆشنبیری بەهرە بەچاپ گەیەندراوە